# چیرۆک و بەیتی کوردی

کۆکردنەوە و ئامادەکردنی:

**عەزیز شارۆخ**



ناوی کتێب: چیرۆک و بەیتی کوردی
کۆکردنەوە و ئامادەکردنی: عەزیز شاروخ
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٤٦
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەمەد زادە
پیت لێدان: ئاراس ئەکرەم
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
هەڵەگریی سەر کۆمپیوتەر: دلاوەر صادق ئەمین
سەرپەرشتیی کاری چاپخانە: ئاوڕەحمان مەحموود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠٢
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (١٧)ی ساڵی ٢٠٠٢ی دراوەتێ

## کورته سەرەتایەک

خوێنەری عەزیز و بەڕێز ئەوەی بەدەستتانەوەیە کۆمایەکە لە ئەدەب و فۆلکلۆری کورد بەناوی بەیت یان چریکە دەگەڵ چەند چیرۆکێک. دیارە چیرۆکەکان زۆر گرنگ نین بەڵکو ئەوەی گرنگە و دەبنە بنەڕەتی پتەوی هونەر و ئەدەبی کوردی بەیتەکانن واتە چریکەکان، کە زۆر بەداخەوە لایەنگرانی ئەدەبی کوردی زۆر کەم سەرنجیان داوەتێ و، خۆیان بۆ ماندوو کردووە کە هەتا ئەوڕۆ بەرە بەبەرە و، سینە بەسینە ڕاگیراون و پارێزراون. بەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە لە ڕادە و ژومارەی بەیت بێژەکان زۆر کەم بۆتەوە. لە ڕاستیا بەرەی نوێ لە ئاواییەکاندا بۆ فێربوونی ئەوانە خۆیان زەحمەت نادەن و گوێی بۆ شل ناکەن. بۆ وێنە باوکی خۆم لەو کەسانە بوو کە بەشی زۆری ئەو بەیتانەی دەزانی و بۆ ئەوەی منیش فێریان بم زۆر جاران بۆی دەگوتمەوە. ئەو وەختی منداڵ بووم ئەگەرچی فێریان بووم بەڵام بەداخەوە زوو لە بیرم چوونەوە. هۆیەکەشی ئەوەبوو کە بەیت بێژ دەبێ خۆش خۆش و زوو زوو بیان گێڕێتەوە ئەگینا لەبیری دەچنەوە. هەر لەبەرئەوەشە کە ئێستا بەیتەکان کەوتوونەتە ژێر مەترسی لە ناوچوون و دراونەتە دەستی فەرامۆشی.

شەش ساڵ لەمەوپێش کاتێ دێ بەدێ و ئاوایی بەئاوایی بەشاخ و کێواندا بەشوێن چرگەرەکان گەڕام و پەیدام کردن و لە خزمەتیاندا بووم، بۆ خۆشیان لەو بابەتەوە هەستیان بەناڕەحەتی دەکرد و دەیانگوت: لاوەکان بۆ فێربوونیان حەول نادەن و نووسەرانیش کەمتر بەشوێنیاندا دێن. ئەڵبەت مەبەستی منیش ئەوەدەمی ئەوەبوو کە هەتا ئەو جێیەی لە توانامدا هەیە بگەڕێم و بەیت و چیرۆکەکان تۆمار کەم و لەکاتی خۆیدا بیانهێنمەوە سەر کاغەز، کەوا ئێستا کۆمەڵێک چیرۆک و بەیتم لە شریتەکانڕا هێناوەتە سەر کاغەز. کە هیوادارم لەلایەن ئێوەوە پەسەند بکرێ، هەروەها پێویستە بڵێم هیچ جۆرە دەستکارییەکم نەکردوون نەوەکو تام و چێژی خۆیان لەدەست بدەن. ئەگەر نووسەر و شارەزایانی بەیت و چیرۆکیش ویستیان ئەوەبێ کە بەشێوەی عیلمی کاری لەسەر بکەن گەردنیان ئازابێ و، دڵنیاش بن کە لە کانگاکانی زۆر باوەڕپێکراوڕا تۆمارکراون و، ڕاستی و ڕەسەنی بەیتەکانیان بۆ هەموو عەلاقەمەندان و لایەنگرانی ئەدەب و فۆلکلۆری کوردی ڕوون بۆتەوە، وەکو حوسێن شەشە لە «بوپانە»ی سەردەشت و حەمەدی ئاغای لە کانیەباغی پیرانشار.

با ئەوەش بڵێم کە ئەو بەیتانە، هەمووی پڕن لە وشە و ڕستەی جوان و ڕەسەنی ئەدەب و هونەر، بۆ وێنە «ئازیزە»ی خلە دەرزی ئەوەندە وشەی جوانی تێدایە کە دڵنیام





خوێنەران پڕ بەدڵ حەزی لێ دەکەن. جگە لەوەش ئەو بەیتانە هەمووی بەسەرهاتی پڕ لە ناکامی و پەژارەی ئەو خەڵکە لێقەوماوەیە کە بەبیروبڕوای من باشترین بەیت لە باری چیرۆکەوە بەیتی لاس و خەزاڵە. چونکە قارەمانی ئەو چیرۆکە هەتا دەمرێ هەر بەهێز و دەستەڵات بووە و، هەرگیز تووشی تێشکان نەبووە.

بۆ بیرەوەری ناچارم بڵێم: ڕاستە ئەوە دەرمانی گەل نییە، بەڵام هیچ گومان لەوەشدا نییە کە دەوام و زیندووبوونی هەموو گەلێک پێوەندی ڕاستەوخۆی بەزیندووبوونی ئەدەب و هونەری ئەو گەلەوە هەیە. هەر گەلێک ئەگەر فەرهەنگ و هونەری خۆی لەدەست بدات بێگومان خۆشی وەبەر لافاوی زەمان دەکەوێ و لەناودەچێ. گەلی کورد ئەگەر نووسەر و پەرتووکیشی کەم بووبێ بەیت بێژەکانی توانیویانە هەتا ئەوڕۆ بەیتە فۆلکلۆرییەکان بپارێزن و ئێستاش جێگای خۆیەتی بنووسرێتەوە و لە چاپ بدرێن.

بەهیوای پەسەندکردن و سەرکەوتنتان

عەزیز شاڕوخ

***

## چیرۆکی شێری مەنەشێر

دەڵێن کەرێک و وشترێک کە زۆریان بار لێ نابوون پشتیان بریندار ببوو. بەرەڵڵا کرابوون و چووبوونە نێو لێرەوارێکی. رۆژێک کاروانێک بەتەنیشت لێرەوارەکەدا رادەبرێ. کەرەکە ڕوو لە وشترێ دەکا و دەڵێ: ئەمن دەزەڕێنم. وشتر کە گوێی لەو قسەیە دەبێ دەترسێ و دەڵێ: کوڕە بۆ خاتری خودای نەکەی، کاروانچییەکان گوێیان لێ دەبێ و دەمانگرن و بارمان لێدەنێن. کەرەکە بەقسەی وشتری نەکرد و دەستی کرد بەزەڕەزەڕێ. کابرایەکی کاروانەکە گوێی لە زەڕەزەڕی کەرەکە دەبێ و دەڵێ: باری ئەو دوو کەرانەم زۆر قورسە وا چاکە ئەو کەرەی بگرن و باری کەم. چووە پێشێ، دیتی وشترێکیش لەوێیە. هەر دووکی دەگەڵ خۆی هێنان و بارە قورسەکانی لە کەرەکەنان. گەیشتنە هەورازێکی، کەرەکە گوتی ئەمن ئەوە خۆ لە عەرزی دەدەم. وشترەکە گوتی بۆ خاتری خودای خۆ لە عەرزی نەدەی ئەتۆش و بارەکەشت لە من دەنێن. بەدبەخت و سەرگەردان دەبم. کەرەکە بەقسەی وشتری نەکرد و خۆی لە عەرزی دا. ئەوانیش بەناچار کەر و بارەکەی لە وشترەکە دەنێن. هێندێکی دیش ڕۆیشتن گەیشتنە سەراوژێرێکی، وشترەکە ملی بڵیند کرد و سەری هێنا بن گوێی کەرەکەی و گوتی: ئەوجار نۆرەی منە، ئەمنیش هەڵدێیم. ئەتۆ چ دەردێکت دا بەمن ئەمنیش ئەو بەڵایەت بەسەر دێنم. بەڵێ، وشترەکە هەڵات و کەروباری بەعەرزێ دادا.

هەردووکیان بەرەڵڵا کردن، بەڵام کەرەکە هەموو گیانی بریندار ببوو. کەرە ڕووی کردە دارستانێک و پاش ماوەیەکی برینەکانی سارێژ بوونەوە. ڕۆژێکی تووشی شێرێکی دەبێ، شێر ڕووی تێدەکا و دەڵێ: لێرە لە چی دەگەڕێی؟ نازانی ئێرە وڵاتی منە؟ گوتی نەخێر وڵاتی تۆ نییە. شێر گوتی ئەمن شێرم. ئەتۆ چی؟ کەر گوتی ئەمن شێری مەنەشێرم، بەخۆم و بەشمشێرم. شێر گوتی زۆر باشە ئەگەر وایە وەرە قەرارێکی دانێین، هەرکەس سێ کاری خەراپی کرد ئێرە بەجێ بێڵێ، کەرە گوتی زۆر باشە. ڕۆژێک قشقەڵێک سەری دەکەرەکە گیرسابوو نەدەهاتەوە دەرێ، شێرەکە ئەوەی دیت پڕی دایە و هێنایەوە دەرێ. کەرەکە گوتی: «هۆیت» ئەوە خەراپێک، شێر گوتی: ئاخر بۆچ؟! ئەمن چاکەم دەگەڵ کردی دەنا دەمردی، کەرە گوتی: نەخێر ئەو قشقەڵە حەکیم بوو، بیلاتەژبی، کۆمی دەرمان دەکردم.

ڕۆژێکی دیش کەرەکە خۆی گەوزاندبوو، لە نێوان دوو داراندا گیرسابوو چوار پەلی دەحەوای کردبوو. شێرەکە، کەرەکەی لەو حاڵەدا بینی لەو داوەش ڕزگاری کرد. کەرەکە ڕووی تێدەکا و دەڵێ: ئەوەش دوو خەراپە، شێر دەڵێ: ئاخر بۆ؟ ئەمن ڕزگارم کردی،





گوتی نەخێر ئەتۆ کارێکی خەراپت کردووە، چونکە حەکیم بەمنی گوتبوو، دەبێ سێ ڕۆژان ئاوا بکەی، پارێزتە دەنا چاک نابییەوە، ڕۆژێکی دیکە کەرەکە لەنێو زەلاوێکی چەقیبوو هەر ملی بەدەرەوە بوو، زۆر ناڕەحەت بوو. شێریش پڕی دەداتێ و ڕاکێش ڕاکێش دەیهێنێتەوە دەرێ. کەرەکە ڕووی تێدەکا و دەڵێ: فەرموو ئەوەش سێ خەراپە. چونکە ئەو زەلاوە دەرمانی دەردم بوو. ئەمن بەئەنقەست چووبوومە دەوێوە. بەڵێ شێر بەناچار ڕۆیی و لێرەواری بەجێهێشت. ماوەیەک ڕۆیی تووشی گورگێکی بوو. گورگەکە لێی پرسی، شێرە بۆ وا ناڕەحەتی؟ شێر گوتی: وڵاتەکەیان لێ بڕیوم، شێری مەنەشێر هاتۆتە جێگاکەم. گورگەکە گوتی: ئەمن ئەوەی دەناسم، ئەوە کەرە، وەرە ئەمن ئەو بەڵایەت لە کۆڵ دەکەمەوە، شێر ترسا، گوتی ئەمن نایەم بەمەرجێک نەبێ، گورگەکە گوتی: چی؟ گوتی گوریسێکی بێنە سەرێکی دەملی من کە و، سەرێکیشی لە ملی خۆت ببەستەوە. گورگەکە گوتی: باشە، وایان کرد. بەرەو لێرەوار وەڕێ کەوتن کەرەکە لە دوورڕا دیتی ئەوە شێر و گورگ بۆ لای ویی دێن و گوریسێکیان لە ملی خۆیان بەستووە. لێیان لە فیڵێ کەوت و ملی نا لە زەڕەزەڕێ. شێر هەر کە دیتی کەر بەجووتە هاوێشتن و زەڕەزەڕەوە دێ، ترسا و هەڵات. چونکە سەرەکەی دیکەی گوریسەکەش بە ملی گورگەکە بوو ئەویشی بەدوای خۆیدا ڕاکێشا و لە بەرد و داری دا. هەرچەندە گورگەکە گوتی: ئەوە کەرە، مەترسێ و ئەمن دەیخۆم، شێر جوابی نەداوە هەتا گورگەکەی کوشت.

***

## بزنۆکە و مەڕۆکە

مەڕۆکێک و بزنۆکێک لە جێ هەواران بەجێمابوونساڵ درەنگ بوو، بزنۆکە گوتی: مەڕۆکە وەرە با جێیەکی بۆ خۆمان سازکەین، هۆڵێک، شتێک بۆ زستانێ بچینە تێوی. مەڕۆکە گوتی خوریلەی خۆم خۆش بێ ئەمن هۆڵم بۆ چییە. بزن گوتی: ئەلحان ئەگەر دەگەڵم سازنەکەی دوایە ئەمنیش ڕێگات نادەم بێیە تێوی. مەڕۆکەش دەڵێ: خوریلەی خۆم خۆش بێ مەهێڵە.

پاییز دادێ، ساڵ درەنگ دەبێ، سەرما پەیدا دەبێ. بزن خانوێکی بۆ خۆی دروست دەکا. مەڕۆکەش لە سەحرایە دەمێنێتەوە. مەڕۆکە زۆری سەرما دەبێ، بەفر دەبارێ. دەچێتە لای بزنۆکەی و دەڵێ: بزنۆکێ جێی سەرم کە، دەڵێ: جێت ناکەم، دەڵێ جێی لاقم کە، دەڵێ جێت ناکەم، دەڵێ جێی دەستم کە، دەڵێ جێت ناکەم، مەڕۆکە لە

سەرمان مندار دەبێتەوە.

بزن دێنێ مەڕەکەی کەوڵ دەکا و دەیکاتە چادر، ڕیخۆڵەکەی دەکاتە ڕستە و لاقێکی دەگەڵ سەری دەکاتە کوتک. لاقەکەی دیکە و دەستەکانیشی دەکاتە سینگ. بزنۆکە لەوێ دەحاوێتەوە هەتا بەهارێ، بەهارێ دەزێ و دوو کاریلەی دەبێ. یەکیان نێو دەنێ تیتل و ئەوی دیکەیان نێو دەنێ بیبل. هەموو ڕۆژێ دەڵێ: ڕۆڵە ئەمن دەچمە لەوەڕێ و، دێمەوە شیری بۆنگۆ دێنم، بۆ خۆشم خۆم تێردەکەم. ئەگەر هاتمەوەش دەڵێم: تیتل و بیبلی دەدایە دەرکەی وەکەن لە مایە، شیرم دەگوانان دایە، شینکەم دەکەلێن ددانان دایە. ئەنگۆش دەرکەم لێ بکەنەوە. ئەوانیش دەڵێن باشە، ڕۆژێکی دەچێتە لەوەڕێ و دێتەوە دەڵێ: تیتل و بیبلی دەدایە، دەرکەی وەکەن لەمایە. شیرم دەگوانان دایە، شینکەم دەکەلێن ددانان دایە. ئەوانیش دەرکەی دەکەنەوە و دەچێتە ژوورێ، وەسبەینێ ڕا دەچێتەوە سەحرایە، ئەگەر بلەوەڕێ. ئێوارێ دێتەوە و دەڵێ: تیتل و بیبلی دەدایە دەرکەی وەکەن لەمایە، شیرم دەگوانان دایە، شینکەم دەکەلێن ددانان دایە. دوو جاری دیکەش وا دەڵێ کەس دەرکەی لێ ناکاتەوە. ئەوجار بەشاخەکانی دەرکەکەی هەڵدەگرێ، دەچێتە ژوورێ. تەماشا دەکا تیتل و بیبل نەماون، دەچێتە سەربانی ماڵی گورگی دەست دەکا بەهەڵبەزینێ. گورگ دەڵێ: کێیە هەڵبەزهەڵبەزێ دەکا، میوانانم لێ شەرمەزار دەکا، کاسە و کەوڵانم لێ پیس دەکا؟

بزن دەڵێ: ئەمنم، ئەمنم بزنۆکێ، دووچاوم پێوەنە بزبزۆکێ، کێ خواردوویەتی تیتلی من، کێ خواردوویەتی بیبلی من، بێتە شەڕە جەنگی من. گورگ دەڵێ ئەمن خواردوومە تیتلی تۆ، ئەمن خواردوومە بیبلی تۆ، دێمە شەڕە جەنگی تۆ.

بزن دەڵێ سبەینێ با بچینە شەرحێ.

گورگ هەمبانێکی دێنێ پڕی دەکا لە تۆز و دوو دەنکە نۆکی تێداوێ و دەڵێ ئەو تووتنەی بۆ مەلای دەبەم. بزنیش ماستی جوان دەکوپەڵەیدا هەوێن دەکا و بۆی دەبا. دەچنە لای مەلای، مەلا دەڵێ: دەبا سیغارێکی بکێشم لە تووتنی گورگی. ئەگەر دەیکاتەوە دەنکە نۆکێک وەچاوێکی دەکەوێ و ئەوی دیکەش وەچاوەکەی دیکەی دەکەوێ. دەڵێ ئەدی بزانم ئی بزنۆکەی چۆنە. لە ماستی بزنۆکەی قامکێکی دەخوا و قامکێکی لە چاوەکانی خۆی دەدات چاوی چاک دەبێتەوە. دێنێ شاخی بزنێ لە ئاسنی دروست دەکا و، ددانی گورگیش لە لۆکەی. جا دەڵێ بڕۆنە شەڕێ. ئەوانیش بۆ شەڕێ دەچنە مەیدانێکی. ئەگە گورگ دای دێتێ ئەوەندەی موو لێ دەپچڕێ، ئەوجاریش دای دێتێ هیچی وەبەرنایە. ئەگە بزنیش لێی دەدا ناو زگی گورگی بەولاتی وەردەکا، تیتل





و بیبلان لەزگی گورگێ دێنێتەوە دەرێ و دەڵێ: ڕۆڵە لە کوێ بوون؟ دەڵێن لە ماڵی خاڵمان بووین، دەڵێ: چوو خوارد، دەڵێن دانۆڵە. دەڵێ ئەدی بۆ بۆ منوو نەهێنا، دەڵێن کۆشمان دەسووتا. دەڵێ چی دیکەشوو خوارد؟ دەڵێن خورما، دەڵێ ئەدی بۆ بەشی منوو نەهێنا، دەڵێن: کۆشمان پیس دەبوو.

***

## چیرۆکی پیرێژن و حەزرەتی سولێمان

دەڵێن لە زەمانی حەزرەتی سولێماندا پیرێژنێک دەچێتە خزمەتی و دەڵێ: قوربان بێ کەسم، کەسم نییە فەعلەم بدەیە خانوێکم بۆ دروست بکەن. حەزرەتی سولێمانیش کە باڵندە و دێو و هەموو زیندەوەرێکی لەبەر حوکم دابوو، دوو دێوی بانگ کرد و پێی گوتن کە بچن خانووی بۆ ئەو پیرێژنە دروست بکەن. دێوەکان بەفەرمانی حەزرەتی سولێمان خەریک بوون و خانوویان بۆ پیرێژن دروست کرد، پاشان بەپیرێژنەیان گوت ئەوە خانووەکەت ئامادەیە، ئایا کاری دیکەت نەماوە؟ پیرێژن گوتی: ناوەڵڵا بەسەدەقەتان بم، دێوەکانیش گورجێ خانووبەرەکەیان ڕووخاند. سبەینێ زوو پیرێژن چووە خزمەت حەزرەتی سولێمان و گوتی قوربان ئەو دێوانەی تۆ خانووبەرەیان بۆ دروست کردم و پاشان لێیان ڕووخاندمەوە. حەزرەتی سولێمان گوتی مەگەر تۆ نازانی کاری دێوان بەپێچەوانەیە؟ تۆ دەبوو کارێکیان بۆ بدۆزیەوە و، نەڵێی کە کارت تەواو بووە. حەزرەتی سولێمان دیسان دوو دێوەکانی بۆ نارد. دێوەکان دەستیان کرد بەدروست کردنەوەی خانووبەرە بۆ پیرێژنێ. ئێوارێ کە بۆیان تەواو کرد، گوتیان پیرێژن ئەوە تەواو بووین، کاری دیکەت نەماوە؟ پیرێژن گوتی بەڵێ کارم ماوە، وەرن ئەو کونەم بۆ فوو لێ بکەن. دێوەکانیش دەستیان کرد بەفوو لێکردن و باوەشێن کردن. لە پڕڕا یەکێک لە دێوەکان قامکی وە عەدەبی پیرێژنێ کەوت، پیرێژن تڕێکی لێ بەربوو. دێوەکان وتیان: ئەها! وەڵڵا دڕا تازە بەکەس چاک نابێتەوە، هەتا زووە با هەڵێین. پیرێژنیان بەجێهێشتوو هەلاتن.

***

## ئاشەوان و کابرای قەرەتاڵەچن

دەڵێن مەلایەک لە خۆڕا لە دێی قوشقی ببوو ملی ڕێگای گرت و گەیشتە ئاواییەکی تر. کابرایەک کە لەبەر گاڕانێ بوو کوڕە کەچەڵێک بوو. لێی پرسی: ئەرێ مامۆستا

ئەوا بۆچ وا بەو ڕێگایەدا هەڵدێیی؟ مەلا گوتی خەونم دیوە کە تۆفانی نووح هەڵدەستێ و من هەڵدێم بۆ لای کەشتی نووح. ئەویش گاڕانی بەجێهێشت و، وەدوای مەلای کەوت. هەردووکیان هاتن گەیشتنە ئاواییەکی دیکە، دیتیان کە پیاوێک قەرتاڵەی دەچنێ و لەو ڕێگەیەوە نانی پەیدا دەکات، کابرای قەرتاڵەچن وتی ئەوە بۆ کوێ دەچن، گوتیان ئەوە تۆفانی نووح هەڵدەستێ. ئەویش گوتی جا ئەگەر وایە منیش دەگەڵ ئێوە دێم. هەستان هەرسێکیان وەڕێ کەوتن. لە ڕێگادا تووشی کوێرێکی بوون، کوێرە لەگەڵ کوێرکێشەکە بەکێشە هاتبوو. کە گوێی لە گرمە و تەپوهۆڕی چەند کەسێک بوو گوتی بۆ خاتری خودای ئەوە چییە؟ وتیان تۆفانی نووح دێ. گوتی جا ئەگەر وایە ئەمنیش دەگەڵ خۆتان بەرن.

هەرچواریان ڕوویان لە ماڵێکی کرد. ژنی کابرای خاوەن ماڵ حەزی لە ئاشەوانێ دەکرد. ئەوێ شەوێش قەراری دەگەڵ دانابوو. ئەو شەوەش مەلا و کابرای گاوان و کوێرە و کابرای سەلە و قەرتاڵانیش لەوێ مابوونەوە. ئێوارێ ئاشەوان دەسرۆکێکی پڕ لە مێوژ و گوێزی ساز کردبوو کە بۆ ژنە تیوێی بەرێ. قەراریشیان وابوو کە پەتێکی لە دەستی بکا و، پەتەی ڕاوەشێنی و بێتە دەرێ.

شەوێ کە ماڵە کابرای هاتن بنوون، مەلا کە هەر لە تۆفانێ دەترسا گوتی: براژن جێگای من لەسەر ئەو کەندەوە چابکە: ژنەکەش هێنای جێگای مەلای لەوێ ڕاخست. جێگای کوێرە و کەچەڵ و کابرای سەلە و قەرتاڵانیشی لەبەر دەرگاکە ڕاخست، هەتاوەکو شەوێ کە چوونە دەرێ نارەحەتی بۆ ئەوانی دیکە ساز نەکەن. کابرای ئاشەوانیش ئاشیر و ماشیری حاواندەوە، دەسرەگوێزی هەڵگرت و چوو بۆ لای ژنەکە. کابرای سەلەوقەرتاڵان کە شەوێ هاتە دەرێ و هەڵترووشکا، دیتی کە پەتێک لەوێیە. بەشوێن پەتەکەدا چوو، تەماشای کرد کە پەتەکە بەدەست ژنی خاوەن ماڵەکەوەیە. کە وای دیت گوتی وەڵڵاهی شەرتە ئەوشۆ ئەمن نەنووم، هەتا بزانم ئەو پەتە چی لێ دێتەوە. لەسەر پەتەکەی دانیشت. هێندەی پێ نەچوو پەتەکەیان ڕاوەشاند، هەر ئەو کێشای و ئەو کێشای. کابرای ئاشەوان وتی: ماڵت خەرانەبێ ئەوە بۆ نایە دەرێ؟ کابرای سەلەو قەرتاڵانیش دەنگی خۆی گۆڕی و گوتی: ئاخر نابێ و ناکرێ، میوانانم هەیە و پێدەزانن. کابرای ئاشەوان گوتی: خێر، دەبێ هەر بێی. ئەوجار گوتی هانێ ئەوە دەسرێکم گوێز و کشمیش بۆ هێناوی. دەسرەگوێزەکەی لێ وەرگرت. دەرگای ئەو زەمانی لە چەپەری بوو، کابرای ئاشەوان............. دەرهێنا و لە چەپەری بردە ژوورێ، کابرای سەلە و قەرتاڵانیش تەڕکی گرتو بڕی. کابرای ئاشەوان بەناڵە و هاوار گەڕاوە بۆ





لای ئاشەکەی خۆی. کابرای قەرتاڵانیش ملی نا لە کشمیش و گوێز خواردنێ. کوێرەش گوێی لەملچەملچێ بوو، گوتی: ئەرێ ئەوە چ دەخۆی؟ گوتی: ئێوارێ قاورمێک لەناو کێشتەکەمان دابوو هەڵمگرت، ئێستا خەوم لێ ڕەویوەتەوە و ئەوە دەیخۆم، کوێرە گوتی: دا بڕێکی بدە بەمن بیخۆم. کابرای قەرتاڵانیش گوتی زۆر چاکە......... بڕاوەکەی دا بەکوێرەی، کوێرەش ملی لە ملچەملچێ نا. کوێرە کە نەختێ چاوی تارمایی دەکرد سەری کابرا کەچەڵەی دیتبوو کە سوور دەچوو، وەدەزانێ ئەوە پۆلووە ئاورە. پێشی وابوو کە گۆشتەکە نەبرژیوە، هەر بۆیە هاوێشتییە سەرسەری کابرای کەچەڵ تاکو بیبرژێنێ و دەستی کرد بەفوو لێ کردنێ. لەولاشەوە کابرای ئاشەوان دەڵێ وەڵڵاهی ئاخری ئەو ژنە پاش ئەو هەموو ساڵە کە حەزی لێکردم ئاخری بەو دەردەی بردم، وا چاکە تۆڵەی خۆی لێ بکەمەوە. ئەویش چوو ئەستێولکێکی سوور کردەوە و بەپەڕۆیەک هەڵیگرت و بەغار هێنای تاکو تۆڵەی خۆی بکاتەوە، سەرلەنوێ پەتەکەی ڕاوەشاند. دیسان کابرای سەلەوقەرتاڵان پەتەکەی گرت و لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەو سەگبابە........ یشی بڕاوە هەر دەست هەڵناگرێ. پەتەکەی ڕاوەشاند و هاتە بەردەرکەی و، گوتی: دیسان چت دەوێ؟

ئاشەوان گوتی: ئاخر دە وەرە دەرێ. گوتی ئاخر پێم گوتی کە میوانم هەیە ناتوانم بێمە دەرێ، گوتی دەنا سمتت بەدەرکەیەوەنێ، کابرای سەلەوقەرتاڵانیش گوتی: خۆ تازە تلپاتی تەڕی پێ نەماوە و چی پێ ناکرێ، سمتی خۆی بەدەرکەیەوە نا و گوتی هانێ.

ئاشەوانیش ئەستێولکەی بەقوونی کابرایەوە نا. کابرای سەلەوقەرتاڵان هاواری کرد و گوتی: مامۆستا بۆ خاتری خودای سووتام. لە کوێرەش وایە کە سەری کابرای کەچەڵ ئاورە و، ئاور پەڕیوەتە کابرای قەرتاڵان، ئافتاوێک ئاو لەوێ دەبێ بەسەری کەچەڵەی دادەکات. کەچەڵیش لەخەو ڕادەپەڕێ و دەردەپەڕێ، هاوار دەکا و دەڵێ: مامۆستا بەو قورعانەی لێت خوێندووە ئاو هات. مامۆستاش کە وەخەبەر دێ و لەخەو ڕادەپەڕێ و چاوی خەواڵوو دەبێ، تیشکی مانگەشەو دەبینی کە لە ژوورەکەی دابوو، وا دەزانێ، کە ئاو هاتۆتە ژوورێ، گوتی وەڵڵا ئەمن کەمێک مەلەی دەزانم، لەسەر کەندووەکەوە خۆی فڕێ دەداتە خوارێ و، دەست و لاقی دەشکێ.

***

## مەڕ و گورگ

دەڵێن کابرایەک سەد مەڕی هەبوو سەگێکیی زۆر باشیشی ڕاگرتبوو. هەموو ڕۆژێ ئەو مەڕانەی دەبرد بۆ شاخی یان نێو مێشە و سەرچۆمی بۆ لەوەڕاندن و دەیهێنانەوە.

ڕۆژێکی ئێوارێ کە هاتەوە دیتی مەڕێکی کەمە و نەهاتۆتەوە. بەشوێن مەڕەکەیدا ڕۆیشت، کە تەماشای کرد، مەڕەکە لەسەر کانیەکیە. کە سڵ بوو بڕێکی هەڵگلۆفی و چەپۆکێکی پێدادا و گوتی: ئەتۆ بۆچ نەهاتوویەتەوە. بۆ چ بەجێماوی؟

مەڕەکە گوتی: ئاخر شەلم، وتی دە هەستە با بڕۆینەوە، گوتی: نایەمەوە قەرارم لەگەڵ گورگ داناوە. گورگ چووە شاهیدی خۆی بێنێ. ئەو دەڵێ ئەو مێرگە ئی منە، تۆ لێت خواردووە، ئەمنیش دەڵێم ئەو مێرگە ئی ساحەبی منە و کرێویەتی. ئێستاش چووە کە شاهید بێنێ. سەگ گوتی: جا ئەگەر وایە بێنە ئەمن بشارەوە و لەبن ئەو قانگەلاشەم بنێ. سەگەکە خۆی شاردەوە. لەو دەمەیدا گورگ لەگەڵ مام ڕێوی هاتنەوە. مام ڕێوی دوور بەدوور ڕوو لە مەڕ دەکا و دەڵێ: ئەوە بۆچ ئەو مێرگەت لەو گورگە خواردووە؟ مەڕەکە گوتی: ئەو مێرگە ئی ساحەبی خۆمە و ئەو کریویەتی، چەند ساڵە پوڵی پێداوە. مام ڕێوی گوتی: نەخێر ناوەڵڵا، ئەشهەد و بیلا ئی مام گورگییە.

مەڕەکەش گوتی: ئەمن وات سوێند نادەم، دەبێ سوێند بەو گومبەزە بخۆی (ئیشارە بەقانگەلاشەکە دەکات) ڕێویەکە ڕۆیی بۆ لای قانگەلاشەکە تا سوێندی بۆ بخوات، کە گەیشتە قانگەلاشەکە دیتی ئەوا سەگەکە لەناو قوڵکەدا خۆی مات کردووە. قەڵمبازێکی هەڵاویشت و خۆی بۆ دەرباز کرد.

مام گورگ گوتی: ئەوە بۆ کوێ دەچی؟

گوتی: ئەوە دەڕۆم سەر حەد و سنوورو بۆ دیاری دەکەم. مام ڕێوی ڕۆیشت و نەگەڕاوە. ئەوجار مام گورگ خۆی گوتی سوێندت بۆ دەخۆم.

چوو بۆ لای قانگەلاشەکە تا سوێندی بۆ بخوات، هەر کە گەیشتەوێ و دەستی پێدادا سەگ لێی دەرپەڕی و مام گورگی خنکاند.

***

## مام ڕێوی و دایە پیرێ

دایە پیرێک بوو تاقە بزنێکی هەبوو. بزنەکەی دەدۆشی و شیرەکەی دەداس کۆڵێدا دەبن مەنجەڵێ دەنا. ڕێوی پێی فێر ببوو هەموو ڕۆژێ دەچوو دەیخوارد، دایە پیرە





گوتی: مام ڕێوی دەردت لە گیانم، جا ڕاوەستێ. تەورداس و کۆلکەیەکی لە پەنای خۆی دانا. دوای ماوەیێ ڕێوی هات سەری مەنجەڵەکەی هەڵداوە و ویستی شیرەکە بخوات، داپیرە تەورداسێکی لە کلکی دا و پەڕاندی. ڕێوی هەڵات و گوتی: دایە پیرە کلکەقوڵەی خۆم وێدەوە، داپیرەش گوتی: بڕۆ شیری بزنەکەی خۆم بۆ بێنەوە. ڕێوی چووە کن بزنۆکەی و گوتی: بزن شیر دا، بۆ داپیر دا، داپیرە کلکەقوڵەی مام ڕێوی دا. بزن گوتی: بڕۆ گەڵام بۆ بێنە. چووە کن دارێ و گوتی: دارێ گەڵا دا بۆ بزن، بزن شیر دا بۆ داپیر دا، داپیرە کلکەقوڵەی مام ڕێوی دا، گوتی بچۆ ئاوم بۆ بێنە، چووە لای کانی و گوتی: کانی ئاو بۆ دار دا، دار گەڵا دا بۆ بزن، بزن شیر دا بۆ داپیر دا، تا داپیرە کلکەقوڵەی مام ڕێوی دا. کانی گوتی: بچۆ کیژانم بۆ بێنە تا لە دەوری من چۆپی بگرن. چووە کن کیژان گوتی: کیژ چۆپی کا بۆ کانی کا، کانی ئاودا بۆ دار دا، دار گەڵا دا بۆ بزن دا، بزن شیر دا بۆ داپیر دا، تا داپیرە کلکەقوڵەی مام ڕێوی دا.

کیژان گوتیان: سۆڵمان نییە، بچۆ سۆڵانمان بۆ بێنە. چووە کن سۆڵکەر گوتی: وەستا سۆڵ دا، کیژ چۆپی کا لە کانی کا، کانی ئاو دا بۆ دار دا، دار گەڵا دا بۆ بزن دا، بزن شیر دا بۆ داپیر دا تا داپیرێ کلکەقوڵەی مام ڕێوی دا.

سۆڵکەر گوتی: هەڕوو هێلکانم بۆ بێنە. چووە کن مریشکە ڕەشەی و گوتی: مریشکە ڕەشە، هێلکەدا بۆ سۆڵکەردا، سۆڵکەر سۆلان بۆ کیژان دا، کیژ چۆپی کەن لە کانی کەن، کانی ئاو دا بۆ دار دا، دار گەڵا دا بۆ بزن دا، بزن شیر دا بۆ داپیر دا، تا داپیرێ کلکەقوڵەی مام ڕێوی دا.

مامر گوتی: هەرزنم بۆ بێنە تا بیخۆم و هێلکانت وێدەم. مام ڕێوی بە فێڵ و گزی لۆچێک هەرزی دزی و دای بەمامر. مامر بەبێ پرسی خێوی چنگێک هێلکەی دانە ڕێوی. ڕێوی هێلکەی بۆ سۆڵکەر برد، سۆڵکەر سۆڵی بۆ کیژگەل کرد. کیژ داوەرینە سەر کانی، کردیان بەچۆپی و شێخانی. کانی ئاوی بەدارگەیاند. دار چرۆ و گەڵای داوەراند. بزن پارووی لێ ڕابادا، بۆ چرۆیان شیری دادا.

لەڕێوی بووە خۆشی خۆشی، پڕ بەقاپێک شیری دۆشی، هات بەلای پیرەدایەوە، ئەویش کلکەقوڵەی دایەوە ...... کلکەقوڵەی بەئاوێ خووساند، بەقیل بەخۆیەوە نووساند.

رووی کردەوە شاخ و کێوی
خۆی گەیاندە گەلە ڕێوی

ڕێوی کردیانە قڕیوە
گوتیان: پف لەو بۆگەنیوە
تۆ دەبێ بارکەی لەو نێوە
نامانەوێی قیلت پێوە
هاتەوە کن پیرەدایە
گوتی: «هەیرۆ وا وەیلایە
هیچ ڕێویم بەلادا نایە
دەڵێن قیلاوی بەڵایە»
داپیر زەنگوڵێکی دایە
ڕێوی بەپەتێکی دوو بست
زەنگوڵەی دەکلکی خۆی خست
بۆ کوێ دەچوو زەنگوڵە شۆڕ
دەیکرد بەزرینگە زرینگ و هۆڕ
ڕێوی گوتیان لە کوێت هێنا ؟
گوتی: لەو گۆمەم دەرهێنا
هەر ڕێوی بوو خۆی تێدەخست
نوقم دەبوون بێ هەست و خوست
گڕی تەماحیان تێ بەربوو
هەتا قڕانیان پێ وەربوو

***

## مام ڕێوی

دەڵێن: ڕاوچییەک تاجیەکەی لە ڕێوییەکی بەردەدا. ڕێوی لە حاڵێکدا هەڵدەهات، دەیگوت: خودایە ئەگەر بێتو لە دەست ئەو تاجییەی ڕزگارم بێ، لە ڕێگای تۆدا ڕبە نۆکێک و گەزە جاوێکی دەکەمە خێر.

وا دەبێ ڕێوی ئەوجارە خەڵاسی دێ و تاجی ونی دەکا. پاشان کە ڕزگاری دەبێ،





دەڵێ خوایە جاوی چی و نۆکی چی.

ماوەیەک ڕادەبرێ، ڕۆژێکی ڕاوچییەکی زۆر دێنە ڕاوێ و تاجیان لە ڕێوی بەردەدەن، ئەوجار ڕێوی دەیگوت: خودایە ڕبەکەت بێنە و نۆکەکەت بەرە، گەزەکەشت بێنە و جاوەکەت بەرە.

***

## چیرۆکی هێلکە و ڕۆن

چوومە ماڵێکی ئاوا، هێلکە و ڕۆنیان لێناوە، لە پێش منیان داناوە. مریشکێک هاتووە لەولاوە، دندووکی پێداداوە. گوتم: هەی کشە کشە، باڵی لێکردم فشە. کەڵەبابی شەیتانی، هەڕای کردە سەربانی، دەستی دا قولەگۆچانی، گوتی: هەی ژنێ ژنێ، تیروکەوانم دەنێ، دەچمە شەڕی قۆشەنێ، قوشەن زۆرە و ناشکێ، ئەستۆ و ڕانم دەشکێ.

کەرێک لەوێ دەناڵی، بردیان بۆ میری شاڵی، میری شاڵی حەمبەڵ بوو، دوو سەد سواری دەگەڵ بوو، هەمووی کوێر و کەچەڵ بوو، هەر خۆمیان ساغ دەگەڵ بوو.

***

## مێروولە و مشک

دەڵێن مشکێک هێندنێکی گەنم لە مێروولێکی بەقەرز وەرگرتبوو، نەیدەداوە، مێروولەش هەموو ڕۆژێ دەچوو داوای قەرزەکەی دەکرد و مشک تووڕە دەبوو، دەیگوت: هۆی سەر ئەستووری نێو قەد باریک بێمە دەرێ ونجڕونجڕت کەم؟ مێروولە ناچار دەبێ پەنا بۆ پشیلەی بەرێ، دەڵێ: جەنابی پشیلە مشک پێم قەرزدارە و، قەرزەکەم ناداتەوە. پشیلە و مێروو هاتنە بەرکونی مشکێ، مێروولە گوتی: مشک بۆ خاتری خودای قەرزەکەم بدەوە. مشک جوابی داوە و تووڕەبوو، گوتی: هۆی سەر ئەستووری نێو قەد باریک لێت بێمە دەرێ ونجڕونجڕت دەکەم. ئەوجار پشیلە لە کەلێنێکەوە گوتی: میاو...

مشک هەر گوێی لە میاوەی پشیلە بوو، گوتی: مێروولە گیان وەرە وەرە کیلۆیەکیشت زیاتر دەدەمەوە.

***

## چیرۆکی مریشکە قوڵە

دەڵێن مریشکێک بوو، مریشکێک. ڕۆژێکی لەسەر چۆمێکی شیوی دەکرد. پاشان سەری خۆی هەڵگرت و ڕۆیی. زۆر ڕۆیی کەم ڕۆیی تووشی شوانێکی بوو. شوانە گوتی: هۆی نازیلێ کەوش تەقتەقی، پێ مەرمەڕی چارۆکە پیوازی، ئەو دەچیە کوێ؟

مریشکە قوڵە دەڵێ: دەچم شوو دەکەم.

شوانە دەڵێ وەرە شوو بەمن بکە. مریشکە قوڵە دەڵێ: بەچم لێدەدەی؟ دەڵێ بەگۆچانی مەڕێ.

دەڵێ بەچیم بەخێو دەکەی؟ دەڵێ: بەنانی مەڕێ.

مریشکە قوڵە دەڕوا و جوابی ناداتەوە. زۆر دەڕوا و کەم دەڕوا، ئەو جار تووشی گاوانێکی دەبێ. گاوان دەڵێ: هۆی نازیلێ کەوش تەقتەقی، پێ مەرمەڕی چارۆکە پیوازی ئەوە دەچیە کوێ؟ مریشکە قوڵە دەڵێ: دەچم شوو دەکەم.

دەڵێ: وەرە شوو بەمن بکە.

دەڵێ: بەچیم لێدەدەی؟ دەڵێ: بەگۆپاڵی گاوانی.

دەڵێ: بەچم بەخێو دەکەی؟ دەڵێ: بەنانی گاوانی.

مریشکە قوڵە دەڕوا و جوابی ناداتەوە. زۆر دەڕوا و کەم دەڕوا، تووشی مشکێکی دەبێ. مشک دەڵێ: هۆ نازیلێ کەوش تەقتەقی، بێ مەرمەڕی چارۆکە پیوازی، ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ مریشکە قوڵە دەڵێ: دەچم شوو دەکەم.

ئەویش دەڵێ وەرە شوو بەمن بکە.

دەڵێ: بەچم لێدەدەی؟ دەڵێ: بەکلکە قوڵەم.

دەڵێ: بەچم بەخێو دەکەی، چم دەدەیەی؟

دەڵێ: هەرچی دەتەوێ دەتدەمێ، گەنمت دەوێ، نۆکت دەوێ، دانووت دەوێ؟ هەرچی دەتەوێ بۆت پەیدا دەکەم. مریشکە قوڵە مێرد بەمشکێ دەکا. ئەوێ شەوێ دانوان لێدەنێن، مریشکە قوڵە دەچێتە کانی ئەگەر ئاوێ بێنی. مشک سەری دانوان هەڵدەگرێ و تێدەکەوێ. مریک دەگەڕێتەوە هەرچەند بانگی مشک دەکا، ژووری دەگەڕێ، نێو دێی دەگەڕێ و هەموو وڵاتی دەکا مشکێ نابینیتەوە، ئەوجار دەچێ سەری دانوان هەڵگرێ، ئەگەر سەری دانوان هەڵدەداتەوە، تەماشا دەکا ئەوە مشک دەوێ کەوتووە و تۆپیوە. زۆر لە خۆی دەدا و، زۆر بەخۆی دادەدا بەڵام فایدەی نابێ و





هەر لەبەر خۆیەوە دەقیرێنێ و دەڵێ:

مشکە قوڵەی..........، کەوتە دیزەی خوانەکە، نەیماوە ئێسقانەکە.

***

## سووری عەیار

دەڵێن کابرایەک سێ کچی دەبێ کە دایکی منداڵەکان دەمرێ، هەموو ڕۆژێ سووری عەیار دێتە لای ئەو سێ کچانە و دەڵێ: بابتان بۆچ ئەمن ناهێنێ؟ ئەگەر بێتوو بابتان ئەمن مارەکا. هەموو ڕۆژێ سەر و لاجانگتان دەشۆم و پاک و خاوێن ڕاودەگرم. ئەوانیش هەموو شەوێ بەبابیان دەڵێن: بابە بۆ سووری عەیار ناهێنی؟ زۆر ژنێکی چاکە. بابیشیان دەڵێ: ئاخر نابێ بەرگی دایکو بدرێ؟!

سێ کچەکان دەچن بەرگی دایکیان دەبەن، ئەوەندەی بەخیزی دەشۆن هەتا شرشری دەکەن و، دەیهێننەوە ماڵێ. شەوێ دەڵێن بابە ئەتۆ بۆچ سووری عەیار ناهێنی؟ بابیشیان دەڵێ ئاخر ڕۆڵە نابێ بەرگی دایکتان بدرێ! ئەوجار منداڵەکان بەرگی دایکیان دەهێننە گۆڕێ و دەڵێن ئەوەتانێ هەموو دڕاوە. ئەوجار باوکیان سووری عەیار مارە دەکا و دەیگوێزێتەوە. بەڵام سووری عەیار تەنیا هەر سێ ڕۆژان دەگەڵ کچەکان باش دەبێ. پاشی سێ ڕۆژەکان بەباوکی منداڵەکان دەڵێ: ئەگەر ئەو سێ کچانە دەرنەکەی ئەوا دەڕۆم و لەو ماڵەدا نامێنم. بابی کچەکان دەڵێ باشە بەڵام ئەوڕۆ تێرێکیان نان و کولێرە بۆ بکە جا بڕۆن.

سووری عەیار شەش نان و شەش کولێرەیان بۆ دەنێو تێرێکی دەنێ و پڕی دەکا لە تەپاڵە......... ئەوجار بابەکە بانگی کچەکانی دەکا و دەڵێ: ڕۆڵە وەرن بڕۆین، بچینە فڵان شاری، سەری کاکم دەدەین. بەڵێ هەموو وەڕێ دەکەون. دوور دەڕۆن، نزیک دەڕۆن دەگەنە نێو دارستانێکی بابەکە ڕوو لە کچەکان دەکا و دەڵێ: ڕۆڵە ئەوە ئەمن دەچم نوێژێ دەکەم. مووررووی دەنگێ بەدارێکەوە هەڵدەواوەسێ و بۆ خۆی دەگەڕێتەوە ماڵێ و، لە چۆل و هۆڵی بەجێیان دەهێڵێ. کچەکان هەرایان دەکرد: بابە، بابە......... بابە بۆچ نایەوە؟ مووررووی دەنگێ جوابی دەداوە: با نوێژەکەم بکەم دێمەوە. خوشکی گەورە دەڵێ بابچین بزانین چییە بەسەر ئەو دارەدا دراوە کە ئێمە بانگی بابمان دەکەین ئەو جواب دەداتەوە. دەچن تەماشای دەکەن، دەبینن ئەوە مووررووی دەنگێیە. مووررووەکەی دێننە خوارێ و دەیشکێنن و دەنگی بابیان دەبڕێ. ئەوجار کە خۆیان لەو چۆل و هۆڵییەی تەنیا و بێکەس دەبینن هەتا شل دەبن هەر دەگرین.

خوشکە گەورەکەیان دەڵێ: ئەو حاڵە بەوحاڵەی ناشێ، با نانی بخۆین. کە تەماشا دەکەن تێرەکە هەر شەش نان و شەش کولێرەی تێدایە. هەریەکەی دوو نانان دەخۆن و شەش کۆلێرەکەی دەهێڵنەوە کە سبەینێ بیخۆن. سبەینێ دەڵێن وەرن با ئەو شەش کولێرەش بخۆین. شەش کۆلێرەکەش دەخۆن، پاشان زۆریان برسی دەبێ. خوشکی گەورە دەڵێ وەرن با میزی بکەین، هەر کەس میزی کەفی کرد ئەوی دەخۆین. میزیان کرد، میزی خوشکی چکۆلە کەفی کرد. خوشکی چکۆلە ڕووی لە خوشکەکانی کرد و، وتی: ئەگەر هەر دەمخۆن، برێکم سەر بدۆزن. ئەوانیش دەڵێن باشە. دەست دەکەن بەدۆزینی سەری خوشکە چکۆلەیان. لە کاتێکا کە سەریان دەدۆزی، خوشکی چکۆلە هەر چیلکەی دەعەرزی دەوەژێنی و سێ دەنکە گەنم وەدەر دەکەون، سێ دەنکەکەی دەخۆن ئەوجار بەهەرسێکیان ئەو جێیە دەکۆڵن تاکو دیسان سێ دەنکە نیسک وەدەر دەکەون، ئەویش دەخۆن. ئەوجار دوو خوشکەکە دەڵێن جا با بتخۆین. خوشکی چکۆلە دەڵێ برێکی دیکەشم سەر بدۆزن، ئەویش هەر جێگەکە دەکۆڵێ هەتا کونێک وەدەردەکەوێ. کونەکەی فرەوان دەکەنەوە، ئەوجار خوشکی گەورە دەڵێ: ڕۆمهێڵن لەسەر خودا و پێغەمبەر تا بزاتم ئەو کونە چییە!

خوشکی گەورەیان ڕۆهێشت گوتی ئەگەر هاوارم کرد هەڵمکێشنەوە، هەڵمکێشنەوە. گوتیان زۆرباشە. خوشکی گەورە چووە خوارێ ئەگەر تەماشای کرد ئەوە مزڵی دێوانە و دیوێکی زۆر خۆشیشە. دێوە چوو بووە بەر مەڕی نان و چێشتیشی بۆ خۆی سازکرد بوو تا ئەگەر هاتەوە بیخوا. خوشکی گەورە چارۆکێکی لە نان و پڵاوەکە دادەگرێ و دەڵێ هەڵمکێشنەوە. ئەوانیش هەڵیدەکێشنەوە. ئەو نان و چێشتە بەشی سێ ڕۆژیان دەکا. پاش سێ ڕۆژان خوشکی گەورە دەڵێ: وەرن با هەرسێکمان بچینە خوارێ لەسەر خودا و پێغەمبەران. دەڵێن باشە. دێوە دێتەوە دەڵێ کێ ئەو خەراپەی پێکردم هەزار خەراپەی دەگەڵ کەمەوە؟ دیتی بۆنی ئادەمیزاد دێ گوتی بۆنی ئادەمیان دێ لە فلان جێگا و مەکانان دێ........ دێو نان و شتی سازکرد ئەوجار زۆر بەهەڕەشەوە بەقوونی گوت: قوونە ئەگەر بێتو خۆ پیس کەی لەسەر سێڵێ دەتسووتێنم.

دێوە چووە بەر مەڕی، سێ کچەکان هەریەکەی قاپێکیان شلکێنە گرتەوە و لە پێش خۆیان دانا، دێوە هاتەوە نوست، شەوێ کچەکانیش هەستان هەرسێک قاپە شلکێنەکەیان لەبن دێوەی ڕشت. دێوە هەستا دیتی خۆی پیس کردووە، زۆر تووڕە بوو تەندووری هەڵکرد و سێڵی لەسەر دانا و سووری کردەوە، پاشان قوونی لەسەر سێڵەکە دانا و سووتاندی. کچەکانیش نێوی خودا و پێغەمبەریان هێنا و دێوەیان دەتەندووری





هاوێشت و دێوە سووتا.

ڕۆژێک پادشا و چەند کەسێک کە بۆ ڕاوێ هاتبوونە ئەو مەڵبەندە و شەویان لێ درەنگ ببوو نەگەیشتنەوە ماڵێ، لە دووررا چرایەکیان دیتبوو، پادشا ڕووی لە هاوڕێکانی کرد و گوتی دەچینە لای ئەو چرایە تا بزانین ئاوەدانییە، چییە؟

دەچنە لای کچەکان ئەوانیش زۆریان بەخێرهاتن دەکەن. پادشا لێیان دەپرسێ: ئێوە بۆ لێرەن؟ کچەکانیش حاڵ و نەقڵیان بۆ پادشای گێڕاوە. شەوێ نان و چای دەخۆن و بۆ سبەینێ تاریک و ڕوونی بەیانی دەڕۆن. ئەو ماڵ و شتەی کە لەوێش بوو بە وەزن سووک و بەقیمەت گران دایدەگرن و لە ئێسترانیان قایم دەکەن. پادشا لە کچەکان خوشکی گەورەیان لە خۆی مارە دەکا هاوڕێکانیشی خوشکەکانی دیکە مارە دەکەن. دەڕۆن دەچنە ماڵی پادشای.

ڕۆژێکی کوێرێک کە سواڵی دەکرد گەیشتە ماڵە پادشای. کچەکان بابی خۆیان ناسیەوە، بەڵا گوتیان نەوەک بابمان نەبێ و بەهەڵەچووبین بۆیە لە کوێرەیان پرسی ئەتۆ بۆچی وات لێ هاتووە؟ بۆچ وا وەسواڵێ کەوتووی؟

کوێرە گوتی: ئەمن سێ کچم هەبوو، ژنێکم هێنا بەنێوی سووری عەیار، ئەویش ئەو سێ کچانەی پێ دەرکردم. ئێستاش ئەوە بۆ خۆم وام لێ هاتووە. کچەکان گوتیان ئێمە ئەو سێ کچانەین و ئەتۆ بابمانی، مووررووی دەنگێت بۆ بەدارێکەوە کردبووین و بۆ خۆت چوویەوە ماڵێ.

کوێرەکە دەستی کرد بەگریان و گوتی: ئەمن نەمزانی ئەنگۆ وا بۆ من چاکن و، سووری عەیار هێندە ژنێکی خەراپە. خەتای خۆتان بوو ئەو ژنەو بۆ من هێنا، ئێستاش ئەمن پەشیمانم.

***

## چیرۆکی تیسکنێ

ژنێک دەمرێ و وەسیەت بۆ کچەکەی دەکا و دەڵێ: ڕۆڵە ئەو ئەنگوستیلەی من بۆ قامکی هەر کەسێکی بوو دەبێ بابت ئەو بێنێ. بابی کەم گەڕا زۆر گەڕا ئەنگوستیلەکەی بۆ قامکی کەس نەبوو کە هاتەوە ماڵێ گوتی دا ڕۆڵە دەقامکتی کە، بزانم. کاتێ کچەکە دەقامکی کرد پیاوەکە تەماشای کرد پڕ بەقامکی کچەکەیەتی، گوتی وەڵڵا ڕۆڵە دەبێ مێردم پێ بکەی. گوتی جا بابە چلۆن مێردت پێ بکەم کافر

دەبی، شادە و ئیمانێ بێنە ئەمن کچی تۆم شتی وا نابێ. بابەکەی گوتی نا، هەردەبێ مێردم پێ بکەی. کچەکە دەڵێ باشە، ئەتۆ برۆ شاری بەرگ و لیباس و زێڕم بۆ بێنە ئەمنیش مێردت پێ دەکەم. باوکی گوتی باشە. پارشێوێ هەستە نان و کولێرانم بۆ تێنێ، بەیانی زوو دەڕۆم. کچەکە پارشێوێ هەستا بابی سازکرد و وەڕێی خست.

پاش ڕۆیشتنی بابی. کچەکە هەڵدەستێ زێڕ و بەرگی خۆی هەرچی بوو هەڵدەگرێ و ملی ڕێیە دەگرێ. کەم ڕۆیشت زۆر ڕۆیشت تووشی مەڕێکی بوو، لەوێ بەشوانەکەی گوت: شوانە ئەمن لیرێکت دەدەمێ ئەتۆ مەڕێکی بکوژەوە و کەوڵەکەی بدە بەمن و، گۆشتەکەشی بۆ خۆت. شوانە گوتی: زۆرباشە. هێنای مەڕێکی کوشتەوە و گۆشتەکەی بۆ خۆی هەڵگرت و کەوڵەکەی دا بە کچەکەی. کچەکەش لەسەر لیباسەکانیرا بەسەرخۆی هەڵکێشا و ڕۆیشت، تووشی نەجارێکی بوو گوتی نەجارِ بەقوربانت بم سندووقێکم بۆ دروستکە بەقەرایە خۆم. لیرێکت دەدەمێ. نەجارِ سندووقێکی بۆ دروست کرد و قەلاڕێژی کرد. کچەکە سندووقەکەی هەڵگرت بردیە سەر کێوێکی بڵێند و چووە نێوی و لەوێرا خۆی خلۆر کردەوە بۆ دۆڵێکی. دوو سێ کوڕە ئاغا بەوێدا هاتن دەگەڵ نۆکەر و مەیتەرەکانیان. یەکیان گوتی: ئەرێ دابزانین ئەو سندووقە چییە لەسەر چەقی ڕێیە کەوتووە! نۆکەران چوونە پێش هەرچەندی کردیان بۆیان هەڵنەهات کوڕە ئاغا هاتە خوارێ و سەری سندووقەکەی هەڵگرت، تەماشای کرد گیانلەبەرێکی تێدایە هەر نەختێک دەموچاوی دیارە دەنا تەواوی لەشی کەوڵە. گوتی ئەتۆ چی؟ دێوی، درنجی چی؟ ئەویش گوتی: ناوەڵڵا نە دێوم، نە درنجم، ئادەمیزادم و بەرگ و لیباسم نییە و بێ کەسوکارم بۆیە وام لە خۆم کردووە. کوڕە ئاغا زگی پێ سووتا و لێی پرسی: لانک و شتت پێ ڕادەژێ، دەتوانی کارێ بکەی؟ کچەکە گوتی: بەڵێ. کوڕە ئاغا لە سندووقەکەی دەرهێنا و سواری پاشکۆی خۆی کرد و بردیەوە ماڵێ. بەدایکی گوت دایە ئەو ئافرەتە فەقیرەم بۆ هێناویەوە. بۆ خۆت هەر لانک و شتی پێ ڕابژێنە و بینێرە بەرقازان. دایکی گوتی جا ڕۆڵە ئەوە چییە ئەو تیسکنە، کوا پیاو دەوێرێ لانکێ بەوەی ڕابژێنێ. کوڕە ئاغا گوتی دەی جا چبوو دایە، فەقیرە. دایکی گوتی زۆر باشە کوڕم.

ڕۆژێک تیسکنێ گوتی دایەخانم گیان، پارۆێک سابوون و شانێکم دەیە دەچم لەو چۆمەی بڕێک سەر و سەکوتی خۆم دەشۆم. خانم شانە و سابوونی دایە و تیسکنێ چووە چۆمێ. کوڕە ئاغاش بەسواری بارگینێکی بەدەم چۆمیدا دەهاتە خوارێ، لە پڕ دیتی تیسکنێ کەوڵی لەسەرخۆی داماڵی و، ئەگەر کەوڵی فڕێدا جوانێکی دیت وەک مانگی





چاردە جوان بوو کە چاوی لەبە هەڵنەدەهات.

بەڵێ تیسکنێ خۆی پاک و خاوێن شوشت و کەوڵەکەی لەبەرخۆی کردەوە و هاتەوە ماڵێ.

لای ئێواری کوڕەکە، دایکی بانگ کردە دیوەخانێ و گوتی دایە ئەگەر شەوێ نان و چات بۆ ناردم، لە تیسکنێ بەدەر کەس حەقی نییە نانم بۆ بێنێ. دایکی گوتی ڕۆڵە جا چۆن مەجوعەمەی بەتیسکنێ دا بنێرم، چۆن بێزت دێ؟ گوتی هەر دەبێ ئەو بۆم بێنێ. بەسێ نۆکەراندا نانیان بۆ نارد هەر فڕێی دا. خانم گوتی تیسکنێ هەستە ئەتۆ نانی بۆ ئاغای بەرە. تیسکنێ گوتی جا دایە خانم چۆن ئەمن نانی بۆ ئاغای بەرم؟ دەستی کرد بەگریانێ. خانم گوتی هەردەبێ بۆی بەری دەنا ئاغا قەڵس دەبێ، برۆ نان و شتەکەی لەبەر دەرکێ دانێ و بگەڕێوە.

تیسکنێ مەجوعەمەی هەڵگرت و چووە دیوەخانێ. کورە ئاغا گوتی دانێ و وەرە ژوورێ. تیسکنێ گریا، گوتی نایەم. کورە ئاغا تووڕە بوو، گوتی ئەگەر نەیە ژوورێ بەو شیرەی لەت لەتت دەکەم.

بەڵێ تیسکنێ چووە ژوورێ، تاوێکی پێ چوو تیسکنێ هەر نەهاتەوە، خانم گوتی دابڕۆن بزانن تیسکنێ چی لێهات، نەکا ئاغا کوشتبێتی!

ئەگەر چوون تەماشایان کرد کەوڵی لەبەر تیسکنێ هێناوەتە دەرێ، تیسکنێ جوانێکە وەک مانگی چاردە. کوڕە ئاغا بەدایکی گوت بڕۆن مەلای بێنن لێم مارەکەن. مەلایان هێنا و لێیان مارە کرد و شایی و زەماوەندێکی خۆشیان بۆ کرد.

***

## حەوت برا و یەک خوشک

کوڕێکی جحێڵ لە ماڵە خۆی ڕا باراشی سازکرد و هات بۆ ئاشی ئەگەر هات نۆرەی وەبەر نەکەوت، گوتیان براگیان ئەوڕۆ نۆرەت نایە، بارەکەت دانێ و بۆ خۆت هەڕۆوە ئاوایی. کوڕەکەش باراشەکەی لە ئاشی بەجێهێشت و ڕووی لەناو ئاوایی کرد و چووە مزگەوتێ. جحێڵ و محێڵ خڕببوونەوە باسی کچانیان دەکرد. ماڵێک هەبوو حەوت برا بوون و تاقە خوشکێکیشیان هەبوو، خوشکەکەیان کە زۆر جوان چاک و لەباربوو، نەجوابی کەسی دەداوە و نەمێردی بەکەسیش دەکرد. جحێڵەکان باسی ئەو ماڵە و ئەو کچەیان دەکرد. کوڕە جحێڵەکەش کە گوێی لەو قسانەبوو ڕووی تێکردن و گوتی ماڵە

ئەو کچەم پێشان بدەن، ئەگەر ئەو کچەم ڕازی کرد کە مێردم پێ بکا دەبێ بەخۆڕایی بمدەنێ. ئەگەر مێردیشی پێ نەکردم ئەوا کەر و باراشەکەو، بۆ بەجێ دەهێڵم.

جحێڵەکان گرێویان لەگەڵ کرد، قەول و قەراریان دانا و کوڕەکەیان بردە ماڵە کچەکەی.

کوڕەکە چووە ماڵی کچەکە و سڵاوی لێکرد، کچەکە سڵاوی لێ ئەستاندەوە و گوتی براله زۆر بەخێربێی، دەڵێی لە ئاشی بووی؟ کوڕەکە گوتی بەڵێ لە ئاشی بووم. گوتی جا ئێرە ماڵە میوانانە، نان و پێخۆرت دەوێ، چرات دەوێ، ئاوردووت دەوێ، هەر چیت دەوێ هەیە. کوڕەکەش لەوێ دانیشت و قوونی وەسەر کۆنە جلێکی دا و دەستی پێکرد و گوتی:

هەلاڵە لە تەڕە زنان
با بۆت بکەم مەدحی ژنان
لە بۆت بکەم مەدحی یاری
ئەو یاری گەردەن بەخاڵی
کەزیەی لەملان بوون بەگۆپاڵ
سەبر سەبر دێمە ناوباڵ
رازیم نەکەی نارۆم لەوێ
هەر ئێستا ماچێکم دەوێ
کچ دەڵێ:
هۆ هەتیوە کاروانییە
هەستە بڕۆ دەر لەو خانییە
پێت قاییل نیم کەلکت نییە
...............
ئەی هەتیوە دەبڕۆ لەوێ
حەوت برایان خوێنیان دەوێ
کوڕ دەڵێ:
ڕەبی حەوت برات بمری





قەدری من چاتر دەگری
ئەوڕۆ لە دوێنێ جوانتری
جارجار چاوم لێ دادەگری
رازیم نەکەی نارۆم لەوێ
هەر ئێستا ماچێکم دەوێ
کچ دەڵێ:
لێت دەبمە ماری سپییە
چل گەز دەچمە بن عەرزییە
لێت ون دەبم وەک دەرزییە
بۆ دیتنەوەم چارت چییە
ئەی هەتیوە دەبڕۆ لەوێ
حەوت برایان خوێنیان دەوێ
کوڕ دەڵێ:
دبمە مەلایەکی عیلم زانە
لە دەورت دا دەنێم فەقێیانە
دەرت دێنم بەعیلمی کتێبانە
لێت دەبڕم بڕ و بەهانە
ڕازیم نەکەی نارۆم لەوێ
هەر ئێستا ماچێکم دەوێ
کیژ دەڵێ:
لێت دەبمە سێوی سەرپەڕێ
نامبینێ کێ بۆم بگەڕێ
بشێەی سەد بەڵات دێتە ڕێ
کەس ناتوانێ بکا زەڕێ
ئەی هەتیوە دەبڕۆ لەوێ

حەوت برایان خوێنیان دەوێ

کوڕ دەڵێ:

لێت دەبمە نەخۆشێکی گران

نە لاقان دەگرم نە دەستان

دەڵێن نەخۆش چت دەرمانە

ئەی دەڵێم سێوی سەر لقانە

هەی ئەویش لەباغی سێوانە

ڕازیم نەکەی نارۆم لەوێ

هەر ئێستا ماچێکم دەوێ

کیژ دەڵێ:

لێت دەبمە دوو چڵە ڕیحانە

لێت دەچمە باغی فەقێیانە

بێی لێت دەستێنن سەرانە

پێم نابەی هیچ زەفەرانە

ئەی هەتیوە دەبڕۆ لەوێ

حەوت برایان خوێنیان دەوێ

کوڕ دەڵێ:

لێت دەبمە شوانی بەرخانە

کاوڕێکم دەدەنێ شەرتانە

دەیدەم بە سەرقەڵەمانە

وەردەگرم دوو چڵ ڕیحانە

ڕازیم نەکەی نارۆم لەوێ

هەر ئێستا ماچێکم دەوێ

کچ دەڵێ:

دەبمە کۆترێکی تەرلانە





دەچمە بن پەڕی هەورانە

لەوێ پێم نابەی هیچ زەفەرانە

ئەی هەتیوە دەبڕۆ لەوێ

حەوت برایان خوێنیان دەوێ

کوڕ دەڵێ:

ئەتۆ کۆتری ئەمن سەقرم

دەتگەمێ و پێشت پێ دەگرم

دەبەر قاقای زارت دەمرم

ئەوڕۆ لە دوێنێ چاترم

ڕازیم نەکەی نارۆم لەوێ

هەر ئێستا ماچێکم دەوێ

کیژ دەڵێ:

هەتیوەی بەگێرە و کێشە

وردە وردە وەرە پێشە

سووچی لێفەی سووک ڕاکێشە

بەعەدەب لاقان تێ کێشە

ئەی هەتیوە دەبڕۆ لەوێ

حەوت برایان خوێنیان دەوێ

دەست لەملانی یەکتر بوون، دەستیان کرد بەماچ و مووچێ. جحێڵەکان کە گرێویان کردبوو دەگەڵ براکانی ئەو کچە لە پشت دەرگا و لە کۆڵانێ خۆیان گرتبوو، خەبەریان بردە مزگەوتێ، گوتیان بابە وەڵڵا کچەی ڕازی کرد. هەر بەو شەوەی کچەیان لێ مارەکرد، باراشیشیان بۆ لێکرد و بەخۆی و بەدەزگیران و باراشی بەڕێیان کردەوە ئاوایی.

***

## بەیتی گەلۆ

وێژەر: حەمەدی ئاغای

ئەو شاعیرەی کە «گەلۆ»ی گوتووە، داد و بێدادی گەلی خۆیەتی دەیکا و دەڵێ پەڕاگەندە بوون بێر و بەوێدا، ئەی گەلۆ.

جا ئەگەر بەنێوی گولانیشی نێو دەبا، دەڵێن دەگەڵ «حەزرەتی پێغەمبەریێتی». دەڵێ:

ئای ئای خەمی دە دڵم ئەوە بۆ وا پەڕاگەندەن بێرە و بەوێدا ئای گەلۆ...........

ئای گەلۆ ئەمن سەرم دێشێ، دڵی من غەریب و غەریبەماڵی ئەوە دەکاتە تەگبیر و ڕاییێ، بەڵام ئەوە کێشە و هەڵایەک پەیدا دەبوو، دە مەعبەینی جوانترین گوڵی دەبەهارێدا و هەوەڵێن خەت و خاڵی دەشیرن لەیلاییێ.

جا ئەوە گوڵان دەیانگوت با ئەمە ئەو نیزاحەی لەنێو بەرینە دەرێ بچینەوە لای بابێ شەماڵێ گەلێک پیاوێکی قەدیمە.

ئەو دێ و ڕادەبرێ سەیرانان دەدا لەسەر ئەوێ کاولە دونیاییێ مەعلوومە ئەو دەگەڵ گوڵان دەکاتەوە ساز و سەوداییێ پرسیاری لێ دەکەین با بۆن مەعلووم کا بزانێ ئەمە جوانترین، یان خەت و خاڵی دەشیرن لەیلاییێ.

جا ئەوە هەلالێ دەیگوت بە بەیبوونی، بەیبوون دەیگوت بەسوورە گوڵێ، سوورە گوڵ دەیگوت بەڕەشە ڕیحانێ، ڕەشەڕیحان دەیگوت بەگیا بەند و خاوێ.

جەمع دەبوونەوە، دەچوونەوە لای بای شەماڵێ، دەیانگوت شەماڵ ئەتۆ پیاوێکی گەڕیدەی و، دێی و ڕادەبری لەسەر ئەو کاولە دونیاییێ. مەعلوومە ئەتۆ دەگەڵ گوڵان دەکەی ساز و سەوداییێ.

شەماڵ تۆ خولاکەی با ئەو نیزاحە لەنێوان بچێتە دەرێ. ئەتۆ بۆن مەعلووم کە بزانە ئەمە جوانترین، یان خەت و خاڵی دەشیرن لەیلاییێ.

بەڵام دەبێ شەماڵ ئەگەر شەرحێن بگۆڕی، ئەتۆ بێ نان و ئاو بی ئەو ڕۆژەی ئەگەر تەرازوو و میزان ڕۆدەندرێن و، خێر و شەڕ بەش دەکرێن لەسەر بەردی سەخرەتولایە.

شەماڵی ماڵ وێران دەیگوت بەخودای، گەلی دەگوڵان، ئەمن پێم وایە هەمووتان گوڵی دەبەهارێن گەلێک پەشمن. ڕەشمن، بۆن خۆشن. بەڵام ئەگەر لەبەر بارانەی پەڵەی نەبێ. ئەنگۆ ناگرن بەری شیددەتی دەگەرماییێ. ئیشک هەڵدێن و، پشوێک





«با» لێودەدا، بەعامو دەچنەوە باری فەنایە.

ئەمن گوڵێکم پێ لەنگۆ جوانترە ئەگەر ساڵ دوازدە مانگە لەسەر ڕەنگێکە قەت تەئخیر و گۆڕانی بەسەر نایە.

گوڵینە بەخولای گلەیی مەکەن ئەنگۆ هێندەن و، هێندەی دیکەش بن ئەگەر ئەو بولبولەشو بێتە گەڵی کە دەخوێنێ لە باغی شەددایە وێستا نابن بەخاڵێکی دەشیرین لەیلایە، های غەمی لە دڵم دە وەرە ڕابرە، های گەلۆ...

***

## بەیتی سێوەخان

بابی سێوەخان کوڕێکی برازای خۆی هەبوو بەناوی محەمەد، پێی گوت: محەمەد وەرە هەتا حەوت ساڵان خزمەتی من بکە ئەو دەمی لەپاش ئەوەی کە شەرتت پەڕی ئەمن سێوەخانت لێ مارەدەکەم، پاشان ئەگەر کەیفت لێ بوو لێرە بمێنەوە، کەیفت لێ نەبوو ئەوا سێوەخانیش دەگەڵ خۆت بەرە. ئەوجار هێنای سێوەخانی لە محەمەدی برازای مارەکرد. محەمەدیش حەوت ساڵان خزمەتی بەبابی سێوەخان کرد.

حەوت ساڵە تەواو بوو، لە مەودای ئەو حەوت ساڵەدا محەمەد سێوەخانی بەدەستەوە نەگرتبوو، بەڵکو هەر بەمارەکراوی مابۆوە. محەمەد و سێوەخان زۆریان یەکتر خۆشدەویست، دڵیان زۆر پێکەوە بوو. کەچی پاش تەواوکردنی حەوساڵ خزمەت، باوکی سێوەخان لە محەمەدی کەوتە فێڵێ و، سێوەخانی نەدایە. پێی گوت ئەمن سێوەخانێ نادەم بەتۆ ئەوە غەدرێکی زۆر گەورە بوو کە لە محەمەدی کرد.

ئەوە ڕۆژێکی دەرۆژاندا، سێوەخان بە محەمەدی دەگوت محەمەد وەرە دەستم بگرە تا بڕۆینە ماڵی شێخ مەحموودی بابی لەتیف حاکمی سولێمانییە، ماڵی مەسڵەتکەر و، ژن هەڵگرانە، قۆناغی غەریبانە. ئەتۆ نەهاتی، لای باوکی من قەولو بڕی بەوەعدەی حەوت ساڵان. لە پاش حەوت ساڵان کە تۆ خزمەتی خۆت بەباوکی من تەواو کردییە باوکی من زاڵم و بەدبەختە ئەمن لە تۆ زەوت دەکردییە عەمرەکەم بەباچوو، نامدا بەتۆ، وەرە دەستم بگرە، وەی نەمێنم یارێ. ئەو جارەکە محەمەد دەیگوت:

ئاخر سێوەخان ماڵە شێخ مەحموودی ئەوەندە دوورە لە چەنگی دوژمنان دەربازمان نابێ. ئەگەر ئەتو دەگەڵ من بێی ئەمن دەستی تۆ دەگرم و دەڕۆینە خوارێ لە بۆ بازاڕی (سیلکێ) لەبۆ ماڵی حوسێن ئاغای لەناو تورکان ماڵە مەسڵەتکەر و ژن هەڵگرانە،

قۆناغی غەریبانە.

سێوەخان دەیگوت: کوڕە ناچینە ماڵە حوسێن ئاغای بازاڕی (سیلکێ) ئەمن دەزانم تورک بەدبەختن، ئەگەر بچینە قەسری دیوەخانی حوسێن ئاغای، بێتوو چاوی بەمن بکەوێ تەماعم تێدەکات و ئەتۆ دەکوژن لە وڵاتی غەریبان، ئەمن بە بەندەواری و بەیەخسیری لەناو تورکان بەجێ دەمێنم.

هەرچەندە سێوەخان بە محەمەدی دەگوت، محەمەد بەقسەی سێوەخانی نەکرد. ئەوە نوێژی مەغریبێ بوو محەمەد پیلی سێوەخانی دەگرت و دەرۆینە خوارێ لە بۆ لای بازاڕی (سیلکێ).

دوازدە شەو و دوازدە ڕۆژان بەرێوەبوون، وەختێکی تەشەبووسیان بەقەسر و دیوەخانێ حوسێن ئاغای کرد.

حوسێن ئاغا لەسەرێ، لە قەسر و دیوەخانێرا دەنۆڕی ئەوە محەمەد هاتووە سێوەخانی پێیە. دەگەڵ چاوی بەسێوەخان دەکەوت عاشقی سێوەخان دەبوو. کوڕێکی هەبوو نێوی ڕەشید بوو، دەیگوت ڕەشید بڕۆ میوانان بەئەدەب دابەزێنە، نازانی محەمەد هاتووە؟ پێیە. ئەمما ئەمن سێوەخانی بە قابیلی محەمەد نابینم، بڕۆ دای ببەزێنە.

فەوری چوار پیاوان لە محەمەد هان بدەن، محەمەدی بدەن بەچواردەستان بڵێندی کەن دەستانی گرێ بدەن بەکەندری، لاقانی سندم کەن، سێوەخانی لە دوو خۆ ڕاکێشن لە بۆ منی بێنن بۆ قەسرێ، تا من بیکەمە خەڵاتی خۆم.

محەمەد نەیزانی کە لێی لەفێڵن، ئەگەر دایان بەزاندن جێبەجێ چوار پیاو هاتن خۆیان لە محەمەدی زی کرد. محەمەدیان بەچوار دەستان بڵێند کرد، فەوری دەستی محەمەدیان گرێ دەدان بەکەندری، لاقیان سندم کردینە، دەیان بردە تەویلەی وڵاغان دەرگایان لەسەر گاوک دەدا.

سێوەخانیان لە پێش چاوی محەمەدی لە دووی خۆیان ڕادەکێشا بەیەخسیری بۆ قەسرێ زۆری لۆ حوسێن ئاغای.

ئەگەر حوسێن ئاغا لەسەرێ، قەسری دیوەخانی، سێوەخانیان بردەلای، ڕووی لە حوسێن ئاغای دەکرد و دەیگوت کوو وا دەبێ، حوسێن ئاغا میوان بەخێرهێنان؟ نازانی ئەمە لە دووی قۆناخ و مەنسووریەتی تۆ هاتووینە. حەوت ساڵان محەمەد کوڕێ تاقانەی دوو تاقە برا و چوار خوشکە، لە وڵاتی غەریبیانە، حەوت ساڵانی خزمەتی ماڵەبابی سێوەخانی کردییە، بەقەول و بڕێ، ئەمن لەبەر نیکاحی محەمەدیم مارەکرایە.





محەمەدم حەوت ساڵە دەزگیرانە، سوێند دەخۆم محەمەدم غەیانەتی بەمن نەکردییە. توخوا سینگ و مەمکی منی لۆ خۆ پاوان کردووە، حەوت ساڵە ئەمن سوێند دەخۆم بێنی نەکردییە.

توخوا حوسێن ئاغا جوو بووم و، لەسەردەستی تۆ موسڵمان دەبم محەمەدیم بۆ بەرەڵڵا بکەن تا من بڕۆم و بمرم لە غەریبیان.

ئەوجار حوسێن ئاغا دەیگوت:

سێوەخان شین و گریانی تۆم بێ فایدەیە، نازانی محەمەدی تۆم وەکو ماسی دەرمانخوارد کردووە و کەوتۆتە بن چۆم و ڕووبارێ. تازە لە بۆ تۆ نابێ، ئەتۆ کۆترێکی زەمانی وەدەستم کەوتووی لەدەستی من خەڵاست نابێ. هەتا مردنێ هەر ئی منی و بۆ من چاکی و بەمن حەڵاڵێ.

سێوەخان دەیگوت:

حوسێن ئاغا، مادام ئەگەر پیاو تەشەبووسێ بەقەسر و دیوەخانێ تۆ بکا تۆ تەماعی تێبکەی، مادام نامووست وا بی بێنە لە پێش چاوی من ژن و نامووسی خۆت لە بۆ محەمەدی تەڵاق بدە جا ئەوجار لە دوایە ئەمن بکە حەڵاڵی خۆت. باپاشی محەمەد بمرم لە غەریبێ.

جا ئەو جار کە ئەو قسەی بەحوسێن ئاغا دەگوت دین لەکن حوسێن ئاغای نەما. بانگی ڕەشیدی کوڕی دەکرد و دەیگوت وەرە ڕەشید تەگبیرێ لە محەمەدی و سێوەخانی بکە، دەیگوت تەگبیری من لەسەر مەسڵەحەتی تووە، هەتا سێوەخان محەمەدی شک بەری لووت بەمندا ناهێنی بەمن قایل نابێ. دەیگوت باوکی من تەگبیری تۆ چییە؟ دەیگوت محەمەدی دەرکەی لەسەر گاڵەوگرێ دراون دوو دەستی بەستراون بەکەندری، لاقی سندم کرانە، هەرۆ خەنجەری ڕووتم بۆ لە دەستی بگرە محەمەدی لە تەویلەی وڵاغاندا دەرگای لەسەر گاڵە و گرێ دراون هەرۆ جووتێ خەنجەرانم بۆ لە سینگ و سەدەفی محەمەدی بدە، دەستی گرێ دراون بەکەندرێ لاقی سندم کرانە، محەمەدیم بۆ شەقار شەقاری خەنجەران بکە ئەوجار جلکی دەخوێناوی محەمەدی بۆ سێوەخان بێنە. ئەگەچاوی پێ کەوت سێوەخان مەجبوورە، هەر قایلە، قایل نەبێ من دەکەم حەڵاڵیە.

ئەو جارەکانێ ڕەشید دەهات وەکی قەسابان خەنجەری ڕووتی لە دەستی دەگرت. ئەو محەمەدی کە دەرگای لەسەر گاڵە و گرێ دراون، دەستی بەستراون بەکەندری... ئەی هاوار.

ئەگەر ڕەشید دەرگای لەسەر هەڵگرت تەماشای کرد محەمەدی لە حەسرەتی سێوەخانێ خەوی لێ کەوتووە، لەنێو زبری وەڵاغاندا ئەگەر محەمەدی خەوی لێ کەوتبوو، ڕەشید بەسەر سەری هەڵدەوەستا و دەیخوری محەمەدی، چاوم بۆ بڵند بکە. محەمەدی لە خەوی شیرین خەوێدا چاوی بڵیند دەکردن. ئەگەر تەماشای ڕەشیدی دەکرد، خەنجەری ڕووتی لەدەستی ڕەشیدی دا دەدیت لە خۆشیانی دەیگوت ڕەشید ئاغا چ خەبەرێکی خۆشت لە بۆ من هێناوە؟ هاتووی دەستانم دەکەیەوە لە کەندرێ، لاقانم بێنیە دەرێ لە سندمێ؟ پیلی سێوەخانم وێ دەدەی و دەرم دەکەی لە وڵاتی غوربەتی و غەریبیان، ئەی نەمێنم.

ئەوجار ڕەشید دەیگوت: نازانی ئەمن ئیزرائیلی قەبزی ئەرواحی تووم، ئێستا لێرە ئەتۆ دەکوژم؟ خەنجەرم بۆیە لەدەستی خۆ گرتووە هەتا سێوەخان ئەتوو شک بەرێ لووت بەباوکی من داناهێنێ، بەبابی من قایل نابێ.

ئەوجار محەمەد دەیگوت: ئەی هاوار، ئەی هاوار، تۆ خودا ڕەشید ئاغا مەمکوژە خۆ ئەمن گیای ئێوارە نیم خەنجەرم لەبەر تاقی مەکەوە. نازانی ئەمن دەستم بەستراوە بەکەندرێ لاقم سندم کرانە؟ ئەمن تاقانەی دوو برا و چوار خوشکم لە وڵاتی غەریبیانم، حەوت ساڵانم خزمەتی ماڵە بابی سێوەخانێ کردیە، لەپاش حەوت ساڵان باوکی سێوەخانێ پیاوێکی زاڵم و بەدبەخت بوو، سێوەخانی نەدامێ ئەمنیش دەستم دەگرت و تەشەبووسم بەقەسری دیوانخانی حوسێن ئاغای بازاڕی سیلکێ کردووە کو دەزانم وا بەدبەختە. وای لێی ڕەشید تو خودا مەمکوژە، سینگ و مەمکی سێوەخانم لێ بەمیرات مەکە، ئێستاکە دەمکوژی هەر دەمکوژی، نامکوژی هەر دەمکوژی، تۆخودا مادام کە دەمکوژی بڕۆ پیلی سێوەخانم بۆ بگرە بۆم بێنە ئێرە تا چاوم پێی بکەوێتەوە لە دڵم نەبێتەوە کۆرپەی مردنێ.

ئەوجار ڕەشید بە محەمەدی دەگوت چاوم لە بۆ بقووچێنە تا دوو سێ خەنجەران لە سینگ و سەدەفان بدەم. محەمەدی دەستی بەستراون بەکەندرێ، لاقی سندم کرابوون، ڕەشیدی هەڵدەکوتانە سەر محەمەدی، شەقار شەقاری خەنجەرانی دەکا. ڕانک و چۆغەی محەمەدی ئاوریشمن لە خوێنێ دا شەلاڵ بوون، نەیدەهێشت ڕوحی لەبەر بچێتە دەرێ پشتێنی لەبەرکرد و ڕانک و چۆغەڵی پێداکەند، لەدەستی خۆی گرت و لە بۆ سێوەخان دەیبردن بۆ قەسرێ زۆری، ئەگەر سێوەخانی لەسەری قەسری دیوەخانێرا دەینۆڕێ جلکی محەمەدی لەدەستی ڕەشیدی دابوون، دەیگوت چ قەوماوە لە محەمەدی من؟ ڕەشید ئەوە جلکی محەمەدی من بۆ لە دەستی تۆدایە؟





دەیگوت نازانی سێوەخان ئەوە جلکی محەمەدیم بەنیشانە لۆتۆ هێناوە تا بە باوکی من قایل بی شەقارشەقاری خەنجەرانم کردییە؟ ئەی هاوار، ئەگەر سێوەخان جلکی لەدەستی ڕەشیدی وەردەگرت لەسەر دەستی خۆی دادەنان، هەمووی کەلێن کەلێن کردبوون بەخەنجەران. هەتا سەعاتی حەوت و هەشتی شەوێ جلکی محەمەدی بەبۆنەوە دەکرد و فرمێسکی هەڵدەوەراند. جا ئەو جار لە پاشی سەعاتی حەوت و هەشتی شەوێ دەیگوت خودایە، هاوار و سەد هاوار خۆ ئەمن محەمەدم چوو محەمەدم نەماوە، تازە ئەمن هەر چەندی دەکەم لەدەستی تورکان دەرباز نابم مەسلەحەتم وایە لەسەر قەسری دیوەخانی ئاغای خۆم فڕێ بدەم، خۆم بکوژم باوەدەستی تورکان نەکەوم.

جا ئەوجار هاوینە، هاوینێکی گەرمە سێوەخان دێتە سەری قەسری دیوەخانێ ئەگەر خۆی فڕێ بدا، ئەوە نیوە شەوە ئەگەر دێتە سەری قەسری دیوەخانێ تەماشا دەکا حوسێن ئاغا لەناو دۆشەگ و بالیفاندا خەوی لێکەوتووە، داری دەبەڕووی بەڕووتی لەبن سەری داندراوە.

سێوەخان دەیگوت: خوایە هاوار و سەد هاوار، خودایە ئەمن پارێزێکی بەرم لە بۆ حوسێن ئاغای، حوسێن ئاغا لەمن بەخەبەر نەیە دەمانچەی لێ بدزم.

جا ئەوجار پارێزێکی دەبرد بۆ حوسێن ئاغای دەمانچەی لەبن سەری حوسێن ئاغای دەرکرد، ناوی خودا و ڕەسولانی هێنا، دەرکەی دەمانچەی سووڕاند و دوو دەمانچەی دەدا لەسەری حوسێن ئاغای. ئەو حوسێن ئاغای لەناو دۆشەگ و بالیفاندا دەکوشت. هات بڕوا، ئەوە غولام تێکیان ڕاخوڕی گوتیان ئەوە سێوەخانە، نەهێنلن دەرچێ، بیسووتێنن بەئاگری.

لە هەر چوار دەورانڕا دەبارینە سێوەخانی تا بیگرن بیکوژن.

خەبەریان دایە ڕەشیدی. ڕەشید دەردەپەڕێ بەسەری ڕووتی بەپێی پێخواسی کە سێوەخان بگرێ و بیکوژێ.

سێوەخان دەمانچەی نا دەبەرلکی چارەکەی کەتانی، ئەگەر ڕەشیدی لێ وەدەرکەوت دەیگوت: ڕەشید نازانی ئەمن بە باوکی تو سەرگرانم، قابیلی نیم و قابیلی نابم. ئەمن ئەگەر محەمەدم چووە لەبۆتۆ نەبێ لە بۆکەسی دیکە نابم. ئەوجار ڕەشیدیشی فریودا. ئەگەر ڕەشید لێی نیزیک دەبوو کە ماچی بکا، دەگەڵ سێوەخان ڕەشیدی لێ نیزیک دەبوو، دەمانچەی لێ هەڵدەکێشا و دوو دەمانچەی دەدا لە زاری سەری ڕەشیدی. ئەوجار سێوەخان دەیگوت: لەو دونیایەدا حەیفە ڕێوی بێ لە جێی شێران، گۆڵە بارگێن

بێتە سەر ئاخوڕی کەحێلان، دەستی هەتیوچە و بێ ناموسان بێتە نێو باخەڵانم لەبۆ شەمامەگرتنێ. جا ئەوجار دەمانچەی هەڵدەکێشا و دوو دەمانچەی لە زاری سەری خۆیدا و مەیتی خۆی دەخستەوە لەناو مەیتی ڕەشید و حوسێن ئاغایە.

ئەو بەیتە لە زمانی «حەسەن ڕەسوڵی»ڕا نووسراوەتەوە.

***

## بەیتی تاڵانی عەلی بەردەشانی

وێژەر: حوسێن شەشە (کەنیلە)
بۆیانەی سەردەشت

عەلی بەردەشانی شاعیرێکی بەنێوبانگ بووە کە هەموو کەس نێوی بیستووە، ماڵی لە بەدەردەشانێ بوو، ژنێکی بوو نێوی پەروەر بووە. پەروەر ژنێکی زۆر جوان بووە. عەلی بەردەشانی لە ماڵ نەبوو، شاگردێکیشی هەبوو نێوی حەمەڕەش بوو. لەشکری عوسمان پاشای دەهات بچێ بۆ لای وڵاتی خۆشناوان و بۆ وڵاتی بێتواتێ.

ئەوەی لەو بەیتەدایە، چوونی چەند سوارێکی عوسمان پاشایە بۆ ماڵی عەلی بەردەشانی بۆ ئەوەی کاو و جۆ و ئەو جۆرە شتانە وەربگرن. دیارە عەلی بەردەشانی لە ماڵ نابێ، کاتێ ئەوە دەزانێ دەچێ شکایەتێ دەکا و دەڵێ سواری عوسمان پادشای تاڵانیان کردووم و بەتاڵانی دادەنێ کە ئێمە لە خوارێ ئەو هۆنراوەی عەلی بەردەشانی کە بەشێوەی بەیت وتوویەتی دەیخوێنینەوە.

«سوار هاتن لە لەشکری عوسمان پاشای، سوارێک چووە دەرکی ماڵە عەلی بەردەشانی، ژنی عەلی بەردەشانی وەدەرکەوت و گوتی: ئەوە چییە، کاکە چت دەوێ؟ گوتی: بێنە کایێ بێنە، جۆیە بێنە بۆ وڵاغی، ئەویش گوتی ئێرە ماڵە عەلی بەردەشانییە، خەرجی نەداوە بێگاری نەکردووە.

گوتی ئەمن نازانم، ئەمن کارم بەعەلی بەردەشانییەوە نییە. ئەمن کارم بەوە نەداوە بێگاری نەکردووە یا خەرجی نەداوە، کاو و جۆی بێنە بۆو وڵاغەی من، ئەمن لەشکرچیم.

بەڵێ جا دەڵێ ژنەکە بەغارێکی چوو سەوەکایەک و ڕیبێکی جۆ بۆ هێنا و دەبەر وەڵاغی کرد. وەختێکی لەشکر ڕۆیی و عەلی بەردەشانی هاتەوە و گەیشتەوە دەرکێ، گوتی ئەو کاوکۆتە چییە؟ گوتی بوویە قونی شەقان و بەربێگار بووی، گوتی چییە؟





گوتی چۆن چییە، سوارێک هاتووە لە ماڵێ دابەزیوە و بەزۆرداری سەوەکایەک و ڕیبێکی جۆ پێ هێناوم پێی دەبەر وڵاغی کردووم.

گوتی هەی نەبێ! گوتی بەڵێ. جا گوتی ئەگەر وابێ زۆرتری بەدوایەدا دەڕوا بانگی حەمەڕەشی کرد و گوتی کەرێم بۆ جل کە و، با بڕۆین. کەری بۆ جل کرد و عەلی بەردەشانی سواربوو و حەمەڕەشی وەپێش خۆیدا و ڕۆیی بۆ شارەزوورێ بۆ قەڵاچوالانی شارەزوورێ بۆ کن ئاوڕەحمان پاشای بەبان. بەڵێ ئەگەر چۆ وێو دابەزی خەبەریان دا گوتیان: عەلی بەردەشانی هاتووە. ئاوڕەحمان پاشا گوتی با بێتە سەرێ. بەقەولێکی دەگێڕنەوە، دەڵێن پلیکانی قەڵاچوالان ئەگەر جێیەکی حاسێ و بڵێندە، دەڵێن شێست پلیکان بووە هەتا وەسەرکەوتن. عەلی بەردەشانی وەسەرکەوت و سڵاوی کرد. ئاوڕەحمان پاشا لێی پرسی و گوتی: ها، عەلی چۆنە هاتووی؟ گوتی قوربان چۆنە هاتووم؟ تاڵانیان کردووم. گوتی چۆن؟ کێ تاڵانی کردووی؟ گوتی وەڵڵا وەسمان پاشای برات. گوتی تاڵانەکەت چییە؟ گوتی قوربان میرزایەکی دانێ بینووسێ هەتا ئەمنیش عەرزت بکەم.

بەڵێ جا دەڵێ میرزایەکیان هێنا کە ماڵە عەلی بەردەشانی حیساب بکا و بینووسێ، بزانێ تاڵانەکەی چەند بووە، ئەگەرچی هەر سەوەکایەک و ڕیبێک جۆ بوو، جا دەستی پێدەکا:

دەڵێ:

ماڵێک بووم لە ڕێزێ ماڵان
ماڵێک بووم لە ڕێزێ ماڵان
تاپێرە سوورێ سەر هەرزاڵان
چەند پڕ و پرێسکەی منداڵان
داس و چەکوچ دەگەڵ ناڵان
دەمدا لەبەر پێی حەداڵان
هەموویان بردووە بەتاڵان
ئاخ درێشەم وەکو چەقڵێ
زیابرنیگ دەگەڵ شەی خوریە
بۆ وانم دەهات گریە
بۆ وانم دەهاتن گری
بە کوڕی یاقوب پێغەمبەری

جا حەدەم نییە نێوی بەرم
کڵاو و دەسرۆکەی سەرم
ئەو عەبای دوێنێ دەبەرم
بەشیان دەکرد بەرانبەرم
لە داخان دەمگوت ئافەرم
حەوت عەمبار برینج و ساوار
هەموویان لێنان بەبن بار
هێندێکیان خوارد هێندێکیان ڕیت
هاتنە سەرم بە فیتەفیت
ڕاستییە پوولیم پێ بلێ دەویت
حەفدە کووپە هەر قاورمە
چاردە کوپەلە شاورمە
کێیە بەو پەنیرەی شەرمە
وەکو هوڕەی لۆکەی نەرمە
حەوت چاڵ گەنمی ئیشکا و ئیشک
چاردە بارۆکە دە مریشک
حەوت چاڵم هەبوون گەنم و جۆ
پێنسەد باتمان لۆکە و پەمۆ
هەموویان بردووە پیاوی تۆ
ماڵ وێران بووم و ڕەنجەڕۆ
بیور و تەشی و تەورداسە
نێر و ئاموور و مەساسە
چەند گوریس، کەژوو، قەیاسە
چەند کەوچک و چەندە کاسە
بۆم هەڵکێشاون هەناسە
میر پێم دەفەرمووی چ باسە
حەوت چاڵم بوون هەزن و کزن
پێنسە مەڕ و سێسەد بزن
سوار لە دەرکێم دادەبەزن





هێندێکیان دێن هەڵدەبەزن
کاوو جۆم لە ماڵێ دەدزن
کەرەکەم شینی گوێ لار بوو
باری کەمی حەوت تەغار بوو
عەلیە کوێری لەسەر سوار بوو
ڕۆینی سەبری نەرمەغار بوو
بەردەشانیم عەلیە کوێرم
ماوە دار عەسا و شمشێرم
پادشام خۆش بێ پێی دەبژێرم

بەڵێ جا گوتی: ئەو تاڵانە بەچەندی پڕ دەبێتەوە؟

گوتی قوربان بۆ خۆت لێت مەعلوومە، نووسیوتە داخودا چەندی دەوێ. دەڵێن سەد شەکی یەکساڵەی دایە. جا گوتی شوانی بۆ ساز کرد و گوتی ئەو شەگەلەی بۆ عەلی بەردەشانی لێخوڕن.

حەمە ڕەشیش گوتی: ئەمن تفەنگێکم دەوێ. گوتی بڕۆن تفەنگێکی بۆ حەمە ڕەشی بێنن. ئەویش تفەنگێکیان بۆ هێنا.

حەمەڕەش تەماشای کرد گوتی: قوربانی ئەمن تفەنگێکم ناوێ ساتۆربێ لوولەزلی دەرمان خۆربێ، لە باسکان و لۆرە لۆربێ. ئەمن تفەنگێکم دەوێ تفەنگ بێ، دەرمانی کەم بخوا و لوولە تەنگ بێ، ئەو بەکاری شەڕ و جەنگ بێ.

جا دەڵێ، گوتیان حەمەڕەش بەرن لەنێو تفەنگان بەکەیفی خۆی تفەنگێکی هەڵبژێرێ. حەمەڕەشیان برد بۆ نێو تفەنگان، بەکەیفی خۆی تفەنگێکی هەڵبژارد. بەمجۆرە ئەویش بەتفەنگی خۆی گەیشت.

***

## بەیتی دوو برالان

وێژەر: حوسێن شەشە (کەنیلە)
بۆپانەی سەردەشت

دوو برالە، دوو کوڕ بوون لە وڵاتی گەرمێنێ، ئی بەری خۆشناوان. ئەو دوو کوڕە پیاویان لەدەست زایع ببوو، یەکیان نێوی خدر بوو ئەوی دیکەیان نێوی حەسەن بوو.

کاتێ ئەو دوو کوڕە لە وڵاتی خۆشناوان پیاویان لەدەست زایع دەبێ یەکسەر دێنە وڵاتی لاجانێ، دێنە لای حەمەد ئاغای مامەش کە وەکی ئەمن بیستوومە بابی قەرەنی ئاغای مامەش بووە. ئەو دوو کوڕە دێنە «سێڵوێ» و لەوێ دەمێننەوە.

خــدریان بڕێک شـــەل دەبێ و پێی دەڵێن خـــدرە شـــەلە، هەر لەبەرئەوەش بە حەسەنیشیان دەگوت حەسەنە شەل. حەسەن کوڕێکی قۆچاغ دەبێ، ماڵی دونیایەشیان هەر ئەوەندە دەبێ ئەگەر پێی بژین. خدر ژنی دەبێ و بڕێک شڕەوبڕە. کە دەیهێنن و دێنە وێ ئافرەتێکیش لەوێ دەبێ نێوی فـاتم دەبێ. زۆر جوان بووە و زۆر کەسی بەئاواتەوە دەبێ بەڵام جـوابی کـەسی نەداوەتەوە، کـەچی حـەزی لەو حـەسـەنیی دەکـرد کـە پێـیـان دەگوت حەسەنە شەل هیچ کەسیش ڕەوای ویی نەدیوە.

دەڵێن داوەتێک پەیدا بوو گوتیان حەسەنە شەل و خدرەشەلان بێن. ئەوان ئی چاک دەزانن. خدرەشیان ئاش وەستایی زانیوە و ئاشی سێڵوێیان هەرچی هەبووە داویانەتە بەوی کە چاکیان بکا.

بەڵێ... جا بانگی خدرە شەل و حەسەنە شەلیان کردووە بۆ داوەتێ.

جـا دەڵێن خـدر گـاوانی گـرت و حـەسـەنە شـەل سـەرچۆپی، ئافـرەتـەکـەش لە داوەتێ دابوو. «جا ئێمە دەڵێین (وانێک) ئەوان دەڵێن (هەنووکە) یا (هینەکە)».

خدرە بە حەسەنەی گوت: حەسەنە، هەنووکە بڵێ بەڵام نێوی مەهێنە (مەبەست نێوی ئافرەتە جوانەکەی نێـو داوەتێ بوو) یانی پێی هەڵبڵێ بەڵام نێـوی ئاشکرا مەکە. جا دەستیان پێکرد و هیچ کەسیش نازانێ ئەوە دەگەڵ ویانە.

خدر:

هەوەڵ زاتێ ئەو خودایە
دووەمینەتی بیسمیللایە
بابەتی مەدح و سەنایە
مەدحی قەت دە تاریف نایە
یارم وەکو زولەیخایە
حەسەن: خۆنا هەتیوە بڵێ
یارم زولەیخای نازدارە
زولفی بەڕیز دێنە خوارە





لەسەر کوڵمەی بە قەتارە
بە عامی دەڵێی ڕەشمارە
جەرگ و دڵ بۆی پارە پارە
خدر: خۆنا کاکە، بڵێ
جەرگ و دڵم بۆی لە کوڵە
گوارە و لەرزانە و سەڵسەڵە
لەسەر کوڵمەی پەڵە پەڵە
یارم نێوی ئایشە گوڵە
جەرگ و دڵم بۆی لە کوڵە
حەسەن: خۆنا هەتیوە بڵێ
جەرگ و دڵم بۆی لە جۆشە
مەمکی هەناری مێخۆشە
بیبە شاران مەیفرۆشە
عالەم بۆو خاڵەی لە خرۆشە
ئاخ دڵی من بۆی لە جۆشە
خدر: خۆنا کاکە، بڵێ
ئاخ لە جۆشە بۆ مەمکانی
سینگت کاغەزی مەرجانی
لەسەردەستی کاتبانی
بیخوێنن میرزای تارانی
هێندێک دەمرن لە سوێیانی
حەسەن دەڵێ: خۆنا هەتیوە بڵێ
هێندێک دەمرن لە سوێیانە
لەسەر سینگی دوو فینجانە
هەردوو قامکانیان نێوان

بۆ هەموو دەردێک دەرمانە
خدر دەڵێ: خۆنا کاکە بلێ
زۆر دەوایە لە بۆ دەردان
وەکو کۆتری نێو شێوەردان
خاسەکەوێ لەسەر بەردان
کیژێ دەدەن بەنامەردان
ئەمەش غەریب و سەرگەردان
حەسەن: خۆنا کاکە بلێ
هەروەکو کەوێ خاڵ خاڵی
حەزن لێکرد بەمنداڵی
بگا عەدی چاردەساڵی
خودا نایدا بەحەلاڵی
بەبێ دەنگی دەچمە پاڵی
خدر: خۆنا هەتیوە بلێ
کەوێ دەگەڵ پۆلێ ئاسکان
کوڵمەی هەروەک هەرمێ ناسکان
خاسەکەوێ باسکە و باسکان
بەندی بوو بە سیا بسکان
حەسەن: خۆنا کاکە بلێ
دڵ کەبابە بۆو مەمکانە
وەک تیری سەر بەپەیکانە
لە جەرگی مەن نیشانە
حەسەن چۆنت دی ئەو جوانە؟
حەسەن دەڵێ: کاکە
ئێوارێکی نوێژی شێوان





دیوارێکمان بوو بەنێوان
دوو قسەم دەگەڵ کرد بەلێوان
ڕەق بوو وەکو بەردی کێوان
نەرمم کرد وەک توولە مێوان
ماچم هەرزان کرد بەپێوان
خدر: ئەگەر وابێ بلێ
خالق هەر تۆی پادشا و جەبار
دونیا خۆش نییە بێ گوارەدار
دونیا خۆش نییە بێ نازداران
یارەب خۆش بێ بۆ جار جاران
ناعیلاجم نێوی دێنم
حەسەن: خۆنا هەتیوە بلێ
نێوی ویم لەسەر زارییە
بەژنی نەمامی ڕەزییە
ڕوومەتی گوڵی جۆرییە ڕوومەت هەروەک گوڵی جۆری
پانیە زەردی پڕ لە مووری
تۆ مەلەکی یانە حۆری
چ مەلەک بی چ حۆری بی
دەتبەم هەرچەند بەزۆری بی
خدر: خۆنا کاکە بلێ
گەیمە ڕێگای قولەتێنێ
ئەوەندەی چاوان هەڵدێنێ
حەوت گۆی زنجیر دەپسێنێ
عالەم بۆی وەحشی دەمێنێ
حەسەن: خۆنا هەتیوە بلێ

هەڵیان دێنێ چاوی ڕەشی
بەهارە مەحەلی کەژی
مەحەلی کەژ و گیابەنێ
خۆم گەیشتمە سەر قۆشەنێ
گوڵیان دەچنی لەدەم ڕەنێ
خدر: خۆنا کاکە بڵێ
گوڵیان دەچنی کڵاو سووران
ئەڕوانێمە کراس گەنجووران
شێت بووم، کەوتمە باسکە و بووران
حەسەن: خۆنا هەتیوە بڵێ
باسکە و بورەم دەپشکنی ئەتۆ غەیبی یانە ونی
تاوێکی با بچمە کنی
ماچ کەم خاڵی بەر گەردنی
خدر: خۆنا کاکە بڵێ
ئەی خودا لەبانی سەرێ
هەرچی سوری ئاشقان بەرێ
بزنەکەی لە کێوی بخورێ
گا جووتی لە ماڵێ بمرێ
کردەوەی قەت وەکۆ نەکرێ
باغی نەگرێ بارێک ترێ
حەسەن: خۆنا هەتیوە بڵێ
بارێک ترێ هەنجیری تەڕ
بەژنی هەڵاڵەیە و شێست پەڕ
عاشیرەتان کردیان بەشەڕ
کیژ کوا بەمن دەکا باوەڕ





خدر: خۆنا بڵێ
کیژ دەڵێ:
لەبەر خودای شەرمێ نەکەم
تۆق و تەلەسمان لێک دەدەم
دەور و دوکانان تێک دەدەم
تاریکستان پەیدا دەکەم
حەسەن: خۆنا ، هەتیوە بڵێ
تاریکستان شەوی دەیجوور
بازرگانان بێنن لە دوور
بێنن کووتاڵی زەرد و سوور
پارچەیە و شیرداغ مسقاڵی
هەر گەزەی لەسەر دە ڕیاڵی
هەر لە دارای تا نەداری
هەر لە فەقیر تا هەژاری
هەر لە سەپان تا کەرداری
کێ دیویە گەنجی حەوت شاری
دوڕێک دەگەڵ تەرزەی باری
خدر جا ئەگەر وابێ بڵێ
ماڵم بۆ چییە دەبڵا نەبێ
فۆتەی پنج پشتم بەن کون بێ
ڕانکۆلەم کۆنە ڕەشکە بێ
پێڵاوی پێم بێ تەتەبێ
بەو شەرتەی یار مەیلی هەبێ
کەوێژێکم لێ زێدە بێ
حەسەن: خۆنا کاکە بڵێ

لێم زێدە بێ ئێرووی ساڵێ

لە کێویش ببڕێ لە ماڵێ

لە کەندووش ببڕێ لە ماڵێ

یار سوێندی خواردووە هیچ ناڵێ

گەر جووت بێن دەگەڵ کەژاڵێ

بەبێ دەنگی بێنمە ماڵێ

داوەت خەڵاس بوو، پەڵە گەنمێک لەبەر ماڵان بوو. ئاغا پێی گوتن: ئەو پەڵە گەنمەی بۆ خۆو بدروونەوە بەنیوەیی، هەردووکیشیان پاڵەی چاک بوون. ئەو زەمانی هەموو کەس، بەهاران دار یان گوێنیان بڕیوە و لە گیشەیان داوە هەتا بۆ هاوینێ ویشک و گزرەیی بێ بۆ ئاوری.

ئەو کوڕانە لەبەر کانی سێڵوێ دروێنەیان دەکرد، ئەو کچەش هەر بەرانبەری وان دەهات و دەچوو. دەڵێن بۆ ئەوەی هێلکە و ڕۆنی کەرەی بۆ کوڕەکە بەرێ، گۆزەی هاویشتە سەر شانی و بەرەڵبێنێکی وەبن هەنگڵی دا و ڕۆیی بۆ کانی کە گەیشتە کن کانییە، دەستێکی لە کوڕەکەی هەڵتەکاند. کوڕەکەش داسی لەبن باقەی دا و ڕۆییە خوارێ بۆ کانی. نان و ڕۆن و هێلکەی خوارد و بەشی براکەی نەبرد. چۆوە لای براکەی، براکەی تەماشای کرد زەردایی هێلکەی بەلێویێوە، دیاربوو بەپەلە خواردبووی و گەڕابۆوە.

جا براکەی دەستی پێکرد، لە خەڵکیش ڕا وایە ڕقەیانە، ئیدی نازانن چ باسە.

خدر دەڵێ:

بەوەی کەم ئەگەر ڕەبییە ئاولانت بم

هەتیو بۆ چوویە کانییە ئاولانت بم

هێلکەی بۆ تۆ کولاندییە ئاولانت بم

حەسەن بێ منت خواردییە........... دە بیبەستە

حەسەن دەڵێ:

بەوەی کەم ئەگەر سەمحانە ئاولانت بم

هێلکە بوو، ڕۆن بوو نانە جیرانت بم





بۆ منی هێنا ئەو چاو جوانە ئاولانت بم

بێ تۆم نەبێ نۆشی گیانە ئاولانت بم

لەسەر دڵمدا سندانە، ...... کاکە بەستم

دەڵێ: ئافرەتەکە ڕۆیی لەبەر دەرکێ، دووی دیکەش لەوێ ڕاوەستا بوون، چوو لەنێویاندا ڕاوەستا و سەیری وانی دەکرد. ئەوان ئەوە قامێ دەڵێن.

خدر دەڵێ:

وردە وردە خۆ دەبزێوی ئاولانت بم

سینگی باغە بچێ تێوی جیرانت بم

چۆن ڕاوەستاوە لە نێوێ...... دە بیبەستە

ئەوجار کچەکە لەنێوایان هاتەدەر چوو لە سەرپەڕێ ڕاوەستا.

حەسەن دەڵێ:

عەمرم دەبەر عەمرت گەڕێ ئاولانت بم

سینگی باغە دەکەن شەڕێ ئاولانت بم

دڵ بریندارم لێم گەڕێ....... کاکە بەستم

ئەو جار کچەکە دەستی دا پەتکۆڵێکی چوو داران بێنیتەوە، هەر دەوری وانی دەدا.

خدر دەڵێ:

برادەری جاروباران ئاولانت بم

یاخودا خۆش بی بۆ جار جاران ئاولانت بم

حەیفێ بەوهەش دەکەن کاران ئاولانت بم

گوریسیان پێ هەڵگرت بۆ داران ....... دە بیبەستە

حەسەن دەڵێ:

کاکە بۆم بکە تەگبیرە ئاولانت بم

کیژ دەڵەی مێوژ و هەنجیرە ئاولانت بم

بەداران دەکولێنێ شیرە ..... خۆ بەستوومە

خدر دەڵێ:

هەتیو من لە تۆ چاکترم ئاولانت بم
لەبەر ڕەوت و ڕۆینی مرم ئاولانت بم
ئەگەر بانگم کا حازرم جیرانت بم
کۆڵەداری بۆ هەڵگرم ..... دە بیبەستە

حەسەن دەڵێ:

ئەو گەیە دەمە، دۆڵێ ئاولانت بم
هۆ هۆی لەبەر نەرموو نۆڵێ جیرانت بم
نەژیم لە دوای خڕ و خۆڵی ئاولانت بم
لە جێم بکێشە بنکۆڵێ ..... خۆ بەستوومە

جا دروێنە و مروێنە خەلاس بوو، کەوتە لای پاییزێ. حەسەن بە خدری گوت: کاکە هەڕو بزانە لەدیوەخانی ئاغای چ باسە، قەولێکیان بەتۆ نەدابوو؟ (دیارە کاتێک ئاغا ئەو قسەی زانیبوو گوتبووی قەرارێ کچەکەی بۆ حەسەنی بخوازم) جا لەبەر ئەوەی بوو کاکی دەناردە دیوەخانێ، خدر دەچوو بەڵام پێی ئیراد بوو لە دیوەخانێ باسی بکا. ڕۆژێکی خدر چووبووە دیوەخانێ، حەمەد ئاغا ڕووی تێکرد گوتی: ها! خدرە شەلە زۆر هاتوچۆ دەکەی کارێکت هەیە؟ گوتی قوربان لەبەر گوفتەکەی بۆ خۆت فەرمووتە. حەمەد ئاغا گوتی بەڵێ قەرارم داوە ئەگەر بۆی بخوازم. بەڵام خدر لەو سەرو بەندەیدا نەخۆش کەوت و مرد. حەسەن هەر هاتوچۆی سەر قەبرانی دەکرد. هەرچەندە حەمەد ئاغا پێی دەگوت و حەولی دەگەڵ دەدا کە ژنی لێ مارەکا و بۆی بگوێزێتەوە، بەڵام حەسەن گوتی: ئاغا خۆ ئەمن منداڵ نیم بەمێوژانم ژیرکەیەوە، ئەمن پاشی برای خۆم ماڵم بۆ چییە و، حاڵم بۆ چییە و، ژنم بۆ چییە. ئاخری ژنی نەهێنا و دەستی لە ئافرەتەکە هەڵگرت.

***

## بەیتی برایم و مەحمەڵ

وێژەر: حوسێن شەشە (کەنیلە)
بۆپانەی سەردەشت

مەحمەڵ و برایم گەرمێن و کوێستانیان کردووە، دەوڵەمەند بوون و ساحەبی مەڕ و ماڵ بوون. هەردووکیان جحێڵ بوون هێندێک دەڵێن ئامۆزابوون، هێندێک دەڵێن





برابوون، هێندێکیش دەڵێن دۆست بوون. بەینیان لە ڕادەبەدەرخۆش بووە. مەحمەڵ برا چووکە بووە و برایم برا گەورە بووە و زۆر جوان چاک و پیاو بوونە.

دەڵێن خەبەریان پێدان کە لە شاری چەلیان جەڵەب زۆر چاک دەفرۆشرێ. پادشای چەلیانیش زۆراب خان بوو. کچێکی بوو خاتوونێ بە کەزبییانیان پێ دەگوت، کوڕێکیشی بوو نێوی حەسەن خان بوو وەزیرەکەشی بە وسوو موغانی مەشهوور بوو. ئەگەر ئەو خەبەرەیان پێ گەیی، دەستە جەڵەبێکیان ساز کرد لە سێ هەزار شەک و زۆر بەتەدارەکێکی حیسابی هاتن بۆ شاری چەلیان. کە هاتنە شاری چەلیان زۆراب خان تەواوی ئەو جەڵەبەی لێ کڕین.

خەبەریان بەخاتوونێ بەکەزیان دا و گوتیان دوو کوڕ هاتوون جوان چاکی و ئازایەتیان لە ڕادەبەدەرە. جا گوتی چۆنیان ببینم؟ گوتیان بنێرە، بڵێ: دەبێ ئەو سەفەرەی جەڵەبێ بۆ من بێنن. ئەویش لەدوای ناردن.

برایم گوتی: مەحمەڵ ئەوە خاتوونێ بەکەزیان کاری بەجەڵەبێ نییە، بەڵکە کاری بەمن و تۆیە ئەمە ئەگەر چووین لەبەر پەنجەرەی ڕادەوەستین، ئەگەر گوتی مەحمەڵ و برایم وەرنە سەرێ ئەوە دیارە کەیفی لەتۆیە، ئەتۆ وەپێش کەوە.

ئەگەر گوتیشی برایم و مەحمەڵ وەرنە سەرێ، ئەوا ئەمن وەپێش دەکەوم کەیفی لەمنە. گوتی زۆر چاکە.

وەختایەک ئەگەر چوون لەبەر پەنجەرەی ڕاوەستان خاتوونێ بەکەزیان سەری هێنا دەرێ، گوتی کێهە مەحمەڵە، کێهە برایمە؟ گوتیان ئەوە مەحمەڵە، ئەوەش برایمە.

جا گوتی مەحمەڵ و برایم وەرنە سەرێ. برایم مەحمەڵی وەپێش خۆی دا و چوونە سەرێ. ئەگە هاتنە سەرێ لەوێ قسە و قەوڵ و قەرارێکیان بەست گوتی بەڵێ ئەتۆ کچی شا میر زۆراب خانی، ئێمەش کابرایەکین پێمان دەڵێن شوانە وێڵە، مەڕدارین ئەمە ناتوانین بنێرین ئەتۆ بخوازین غەیاتی دەکرێ ئەگەر ئەتۆ دەگەڵمان بێی. ئێمە ئەتۆ هەڵدەگرین.

بەڵێ ئەو قەرارەیان دانا و چوونەوە مەملەکەتی خۆیان. ئەگەر چوونەوە چەند هەزار سەرێکیان جەلەب ساز کرد و چەند پیاوی ئازا و بەکاریان دەگەڵ خۆیان هێنا و هاتنەوە شاری چەلیان. جەڵەبەکەیان فرۆشت و تەدارەکێکیان گرت. خاتوونی بەکەزیانیش شەوێ دەچاکدا ڕەگەڵیان کەوت، هەڵیانگرت و ڕۆیشتن.

خەبەریان بە شا میر زۆراب خانی دا و گوتیان: مەحمەڵ و برایمی دەشتیان خاتوونیان

برد. میر زۆراب خان کەوتە پەی سەر و لێپرسین و ئەوبەر و ئەوبەر، بەڵام لە هیچ کوێ سەر و سۆراغی نەکردن. ڕۆژێکی مەجلیسی گرت و دانیشت، جا شای میر زۆراب خان ڕووی دەمەجلیسێ کرد و دەستی پێکرد، دەڵێ:

کێ بوو لە بۆ شای میر زۆراب خانە
ئامادەی کرد مەجلیس و دیوەخانە
دەنگی هەڵدێنا ڕووی دەکردە وەزیر و نایبانە
هەر کەسانێکی بۆم بێنن خەبەری مەحمەڵ و برایمی دەشتیانە
بە قەباڵە لێم بستێنێ نیوەی شاری چەلیانە
دەڵێ: کێ بوو لەبەر وسووی موغانە
ڕووی دەکاتە شای میر زۆراب خانە
دەڵێ شای میر زۆراب خانە
ئەمن دەڕۆم ئەمما بۆت دێنم خەبەری مەحمەڵ و برایمی دەشتیانە
بەقەباڵەم ناوێ شاری چەلیانە
ئەمما وەختێکی مەحمەڵ و برایم هێنان
ئەتۆ بیدە بە کوڕی من خاتوونێ بەکەزیانە

بەڵێ، جا ئەگەر ئەوەی پێ گوت قەراری دەگەڵ بەست. وسووی موغانێ سوار بوو لێیدا ڕۆیی.

ئەو شەگەلی ئەگەر کرِدرا بوو، چ دروشمێکیان پێوەبوو لەبەرچاوی دەگرێ. زۆر گەڕا هەتا دەستەمەرێکی دیبیەوە کە ئەو دروشمەیان پێوەبوو. پرسی لە شوانی، گوتی ئەو مەڕە ئی کێیە؟ گوتی ئەو مەڕە ئی مەحمەڵ و برایم دەشتییە.

گوتی ماڵ و مزڵیان لە کوێیە؟ وەڵامی داوە بەڵێ لەوەی بەو دیودا، هەوار و کوێستانی ئەوانە. جا هەستا چوو میوانیان بوو، برایم و خاتوون ناسیان ئەمما مەحمەڵ نەیناسی، برایم بە خاتوونی گوت ڕاستییەکەی لەکن مەحمەڵ مەڵێ، مەحمەڵ پیاوێکی کەلەییە.

ئەمە خەراپێکمان دەگەڵ شای میر زۆراب خان کردووە، بزانین وسووی موغانی کە وەزیری ویە چ نەزەرێکی هەیە؟ ئەگەر بێتو پێی بلێی یان دەیکوژێ یان شتێکی دەگەڵ





دەکا، کە دەبێتە دوو خەراپە دەرحەق بەوی.

جا دەڵێ وسووی موغانی لەوێ ماوە وردە وردە دەستی بەقسان کرد هەتا بۆ خۆی، خۆی ئاشکرا کرد. مەحمەڵ گوتی دەیکوژم، برایم و خاتوون گوتیان: نا، نا نەکەی، ئەمە خەراپێکمان کردووە، نایکەین بەدوو، دەڵێن، وسوو زمانێکی تەڕ و پاراو و لووسی هەبوو، هەرسێکی فریودان. سوێندی بۆ خواردن گوتی شای میر زۆراب خان ئەگەر ئەمنی ناردووە سەردەقانو پێ نەرم کا و سەرحەدانو پێ بگرێ.

بەکورتی فریوی دان و هەرسێکی دەگەڵ خۆی هێنان، گوتی: قەرار ئەوە بێ ئێوە لەشکری دەگەڵ خۆتان بێنن شای میر زۆراب خان تۆمەتێکو لێدەدا، دەڵێ هەڵبەت بەلەشکرەوە هاتوون.

ئەگەر ئێوە بێن ئەمن دەگەڵ ویتان ئاشت دەکەمەوە، سەرحەدانی بۆ بگرن سەردەقانی بۆ نەرم کەن. قەرارمان ئەوەبێ لە ئەشکەوتی «بێ شوێ»* دابنیشن هەتا ئەمن خەبەری شای میر زۆراب خانی دەدەم و دەگەڵ ئێوەی ئاشت دەکەمەوە.

دەڵێ، هاتن هەتا گەیشتنە ئەو ئەشکەوتەی و، لەوێ مانەوە.

جا، وسووی موغانێ هەستا ڕۆیی بۆ شاری چەلیان، خەبەری بە شای میرزۆراب خان دا و گوتی: فریوم داون و هێناومنەوە بەبێ لەشکر، هەر خاتوونێ بەکەزیان و مەحمەڵ و برایمن.

گوتی: ئەگەر وایە بنێرن بەدەست بەستراوی بیانهێنن.

گوتی شای میرزۆراب خان ئەوانە شێرن، بەلەشکرێکی عومدە نەبێ پێیان ناوێرین.

بەڵێ، تەهییەی لەشکریان کرد، وسووی موغانی دەستەودایرە و تایفەی خۆی ئەوەندەی بوون سازی کردن. لەشکری حەسەن خانی کوڕی شای میرزۆراب خانیش بەجوێ هات. لەشکری شاری چەلیانیش دەگەڵ شای میرزۆراب خانی هاتن. جا سبحەینێ زوو لە شاری چەلیان وەدەرکەوتن. ئەوانیش ئەوە لە ئەشکەوتی بێ شوێ چاوەڕوانی ئەوەی بوون ئەگەر وسووی موغانی بێتەوە و بیانباتە لای شای میرزۆراب خانی و دەگەڵ وی ڕێک بکەونەوە.

سبەینێ برایم ئەگەر هەستا، تەماشای کرد ئەوە لەشکرێک لە شاری چەلیان دێتە

(*) ئەشکەوتی «بێ شوێ» لەکن ئاوایی وسووکەندییە کە لە ٦ کیلۆمەتری مەهابادە بەدەستی چەپەوە و بەئەشکەوتی «خەلوێ» ناوبانگی هەیە.

دەرێ، لەشکرێکی یەکجار زۆرە. خاتوون و مەحمەڵ هەڵنەستابوون، جا برایم بانگی کردن.

چار ملێ بوو لە برایمی دەشتیانە
ئەو بانگ دەکا دەڵێ مەحمەڵە گیانە
سەرم لە ئێشە، دڵم لە ژانە
ئەوە ئەتۆ سەرت هەڵێنە لە خەوی شیرین
ئەمما لەسەر باسکی خاتوونی بەکەزیانە
ئەوە لەشکرێک دێتە دەرێ لە شارەکەی چەلیانە
لەشکرێکی یەکجار زۆر و، زۆر بەوگرانە
نازانم نەدەڕوا بۆ سەر دوژمنی، بۆ سەر حەدانە
نازانم نە دێ بۆ سەر مەحمەڵ و برایمی دەشتیانە

ئەوە برایم دەڵێ:

کاکە مەحمەڵ سەرم لە ئێشە، دڵم لەغارە
ئەتۆ سەرت هەڵێنە لەسەر باسکی خاتوونی بەکەزیانی چاو بەخومارە
ئەمما لەشکرێک دێتە دەر لە شارەکەی چەلیانە
لەشکرێکی زۆر زۆر و بەبێ هەژمارە
نازانم نە دەڕوا بۆ سەر حەدانە
نەدێ بۆ سەر مەحمەڵ و برایمی بێ چارە

دەڵێ:

کاکە مەحمەڵ ئەمما چەندم پێ گوتی بەسەر زبانی
ئەمما برادەر بەقسەی منت نەکرد و ئەتۆ هەوەڵێت نەزانی
چەندم پێ گوتی فریوێ مەخۆ، فریوی وسووی موغانی
ڕەبی بە نەحلەت بێ دەگەڵ شەیتانی
ئەرێ
کاکە مەحمەڵ گیان سەرم دێشێ دڵم لە ژانە





سوێندێکت بۆ بخۆم بە سی جزمەی قورعانە
ئەوڕۆکانێ ڕۆژێکە، ڕۆژی مەردانە
پێمە شیرێکی لاهوری هەر لەوی عەسڵەدەبانە
بەدەستمەوە ڕمبێکی هەژدە قەفی لەوی سەر بەحەیزەرانە
ئەمما کاکە مەحمەڵ گیان ئەمن سوێندێکی دەخۆم بە سی جزمەی قورعانە
شیری خۆم خوێناوی ناکەم هەتاوەکو نەکوژم وسووی موغانە
دەبێ لە دەرکی ئەشکەوتێ ڕابوەستی هەر دەگەڵ خاتوونێ بەکەزیان
لە برایمی بڕوانە.

جا دەڵێ مەحمەڵ سەری هەڵێنا، ئەگەر تەماشای کرد ئەوە لەشکرێکی یەکجار زۆر و زەوەند لە ژێلەڵلا دێ مەگەر خودا بزانێ. کاتێ نیزیک بوونەوە برایم زانی کە بۆ سەر ئەوان دێ، ئەو لەشکرە بە هەر چوار ئەترافیدا بۆ سەر ئەوان دێ و غەنیمی وانە.

جا برایم سوێندی خوارد گوتی مەحمەڵ هەتا ئەمن نەکوژرێم ئەتۆ نابێ بێیە خوارێ، ئەگەر ئەمنیش کوژرام کەیفی خۆتە. چونکە ئەگەر ئەتۆ بێی ئەمن زەینی شەڕێم نابێ لەبەر تۆ، ئەوە ئەمن دەچمە خوارێ.

سواربوو سەرەوژێر بوو، ڕۆییە خوارێ، لەشکری وسووی موغانێ لەپێشدا دەهات و وسووی موغانیان لەپێشدا بوو.

دەڵێ:

ئەوە کێ بوو لەبەر وسووی موغانی
بە نەحلەت بێ دەگەڵ شەیتانی

بانگ دەکاتە برایم و مەحمەڵی دەشتیانی، ئەو جارە کە بەحاڵی خۆو دەزانی چونکە غەیانەتیو کرد بەدەرکی میرزۆراب خانی.

ئەوە برایم دەڵێ:

سەرم لە ئێشە دڵک چەندی لەژانە
قایمەتی دەژانە ژانە، هەڵی دەکێشا شیرێکی لاهوری لەوی عەسڵەکرمانە
بەدەستێوەیەتی ڕمبێکی هەژدە قەفی لەوی سەر بەحەیزەرانە
دەڕۆییە خوارێ و ڕووی دەکردە وسووی موغانە

بەرەنگار دەبوون ئەو دووانە.

دەڵێ:

رۆڵە برایم مەردێکی چا زانی

ئەورۆکانە مەردێکی مەردی مەیدانی

ئەمما هەڵی دەکێشا شیر لە کالانی

ئەوەڵ کەرەتێی لەنێو لەشکرێدا دەکوشت وسووی موغانی.

دەڵێ:

کاکە مەحمەڵ گیان سەرم لە ئێشە و دڵم لە ژانە

ئەورۆکە رۆژێکە رۆژی مەردانە

ئەتو لە دەرکی ئەشکەوتێ رابوەستە دەگەڵ خاتوونێ بەکەزیانە

هەتا نوێژی نیوەرۆیە هەر لە برایمی بروانە

بۆم حەواڵە بکە، هەتا نوێژی نیوەرۆیە دوو سەد سواری یەکەیەکە لە شارەکەی چەلیانە.

برایم دەڵێ:

سەرم لە ئێشە و دڵم لە تاوە

قایمەتی لە تاوە تاوە

چەند جارێ بەنێو لەشکری دادەهاتوو دەگەڕاوە

برایم هەتا نوێژی نیوەرۆیە

چەند کەسی لە لەشکری شای میرزۆراب خانێ دەکرد تەواوە

دەنوێژی نیوەرۆیەدا بەبریندار بۆ زاری ئەشکەوتێ دەگەڕاوە.

بەڵێ برایم چەند برینی هێنا، ئەگەر گەیشتە زاری ئەشکەوتێ لە ولاغێ را خۆی فڕێدا و کەوت. نەیاندەتوانی بەدوایاندا بێن چونکە لە دەرکی ئەشکەوتێ را هەرچی هاتبایە بەتیری هەڵیاندەداشت. بەرەوەی هەورازە و ئەشکەوتەکەش بڵیندە. ئەوێ شەوێ خاتوون و مەحمەڵ لەسەر برایمی دەستیان بە پێهەڵگوتن و گریانێ کرد.

مەحمەڵ دەڵێ:

کاکە برایم سەرم دێشێ دڵم دەکا ژانێ





ئەمما بۆ تو چاک نەبوو ئەگەر بەتەنێ چوویە مەیدانێ

دەگەڵ لەشکری شای میرزۆراب خانێ

دەستت دەکرد بە شیر لێدانێ

ئەلحان دەگەڵ خاتوونێ ئەو بەرەوبەر دانیشتووین

ورده ورده بۆت دەکەینەوە شین و گریانێ

ئەلحانەکە مەڕی کاکە برایمی ئەو سەعاتەی بێ ساحەب ماوەتەوە

لە تیلەگی دەکوێستانێ

ئەوە خاتوون دەڵێ:

کاکە برایم گیان ئاخ سەرم دێشێ دڵم دەناڵێ

ئەمما تو خوداکەی ئەورۆ هەڵیکە دەوردەبارانی رەحمەتێ

دەگەڵ کزەکزەی دەشەماڵێ

ئەرێ بەخودای

مەحمەڵ و برایم ئەوە تاوڵ و رەشماڵیان هەڵداوە

لە بنەی توشماڵێ

بەبێ ساحەبێ ماونەوە هەر مەڕ و ماڵێ

بەڵێ، سبەینێ برایم بە برینداری هەستا هەرچەند مەحمەڵ ئەوبەرئەوی کرد مەحمەڵی نەهێشت، گوتی هەتا ئەمن نەکوژرێم ئەتۆ مەیە خوارێ. برایم سواربوو مەحمەڵیش بەدوای ویدا رۆیشت.

جا برایم دەڵێ:

کاکە مەحمەڵ گیان لە دڵی من گەڕێ بەبێ قەراری

تەواو بۆ من و تۆ دەنگ دراوە لەشکری شاری

ئەمما لە ئەشکەوتی بێ شوێنی

لێ قەوماوە بەفەقیری و هەژاری

دەبێ چاوێکم لەتۆ بێ و بەدەستی شەڕی بکەم هەر بەبرینداری

ئەوە سەرم لە ئێشە دڵم لە هۆیە

برایم شەڕی دەکرد هەتاوەکو نوێژی نیوەڕۆیە

ئەمما برایم ڕمبی چەقاند گۆڵمی تێکرد، تەقدیرێ خودای بوو سەری وێ کرد ئەو بەبێ ڕوحی گیانی خۆی دەرد و برد

ئەوە مەحمەڵ دەڵێ:

سەرم لە ئێشە هەر دڵم لە ژانە

قایمەتی دەژانە ژانە

مەحمەڵ بەدەستێوەیەتی شیرێکی لاهوری

لەوی دەعەسڵە دەبانە

ئەمما ڕووی دەکردە نێو لەشکری شای دەمیرزۆراب خانە

ئەوەڵ کەرەتێی دەکوشت حەسەن خانە

هەڵی دەگرت برایمی دەشتیانە

دەی بردەوە بۆ ئەشکەوتێ

بۆ کن خاتوونێ بەکەزیانە

بەڵێ، ئەگەر مەحمەڵ برایمی بردەوە وێ بەکوژراوی، شەوێ شینی برایمیان گێڕا بە خاتوونێ و بە مەحمەڵێ، هەتا سبەینێ ڕۆژ بۆوە، سبەینێ مەحمەڵ خودا حافیزی لە خاتوونکردە و سەرەوژێر ڕۆییە خوارێ.

خاتوون گوتی: مەحمەڵ، وەک نەیەوە وایە، مەحمەڵ ڕۆیی ......

مەحمەڵ دەڵێ:

دڵی من چەندی لە خەمە چەندی لە ئێشە بە بریندارى

تۆ خولاکەی خەمی لە دڵم چەندە زۆرن بەبێ قەراری

خاتوون لە خزمەت تۆوە دەڕۆم خولا حافیز هەر بە یەکجاری

مەحمەڵ دەڵێ:

سەرم لە ئێشە دڵم هەر لە ژانە

قایمەتی لەژانە، ژانە

مەحمەڵ هەڵی دەکێشا شیرێکی لاهوری لەوی عەسڵە دەبانە





بەدەستێوەیەتی ڕمبێکی هەژدە قەفی سەر بە حەیزەرانە

لە شانیدا کەوانێکی خاسەڕەنگ دەگەڵ سەت و بیست و چوار

تیری سەر بەژەهری ماری دانەدانە

دەکەوتە نێو لەشکری شای میرزۆراب خانە

دەڵێ خۆ من بکوژرێم مەنزوورم نییە

ئەمما حەیف بەتەنێ دەمێنێتەوە خاتوونێ بەکەزیانە.

جا مەحمەڵ دەڵێ:

ئەورۆکانێ شەڕە هۆبەهۆیە

لەشکرێکیان، لەشکرێ گەورەی دەگرت بەنوێژی نیوەڕۆیە

ئەوە مەحمەڵ تێی دەکەوت هەتا مەحەلی پاش نوێژێ

لە هێندێک دادە لە هێندێک ڕۆڕۆیە

دەڵێ سەرم لە ئێشە دڵم لەتاوە

خودایە ئەوە چ بوو، چ لەمە قەوماوە

مەحمەڵ هەتا نوێژی عەسرێ شەڕی دەکرد لە دوایە لەسەر ولاغێ ئەویش هەر وەردەگەڕاوە.

جا دەڵێ ئەگەر مەحمەڵ کوژرا، خاتوون لیباسی برایمی دەبەرکرد و هاتە خوارێ دەڵێ هەر بەو شەرتەی مەیتی مەحەمەڵیم وەگیر کەوێتەوە.

دەڵێن خاتوون ئەگەر گەیشتێ مەیتی مەحمەڵی هەڵگرت و بردیێەوە بۆ ئەشکەوتێ. لە زاری ئەشکەوتێ ڕاوەستا، تیری لە ماڵی کەوانی نا، هیچ کەس نەیوێرا بچێتەوێ. جا شای میرزۆراب خان بەئەژنۆی خۆی دادا و گوتی کوڕیشم چوو کچیشم چوو، بۆ خۆشم هەر چووم. چەند کەسان لە وەزیر و نایبێ ئەگەر لەکنی بوون یەکیان گوتی شای میرزۆراب خان ئەمن دەچم خاتوونێ دێنمە خوارێ، بەو شەرتەی دەیهێنمە خوارێ ئەگەر ئەتۆ هیچ بەخاتوونێ نەڵێی. گوتی: بەڵێ ئەمن کوڕێکم بوو ئەویش کوژراوە. ئەگەر خاتوون بمێنێ بۆ من زۆر شەرتە. بەڵێ، جا سوێندیان بۆ خاتوون خوارد، خاتوون دەڵێ نایەمە خوارێ هەتا مەیتی برایم و مەحمەڵی لەجێیەکی نەنێژن لە شاری چەلیان، جا دێم. گردێک لە بەینی وسووکەند و قونقەلایەیە، وەکی دەڵێن لەسەر ئەو گردەیان ناشتوون کە ئێستاش وارشی بەردی لێیە.

خاتوون کە حامیلە بوو کاتێ بردیانەوە دوو کوڕی بە زگێکی بوون، یەکیان نێو نا مەحمەڵ یەکیان نێو نا برایم هەتا گەورە بوون. هەڵبەت لەکن شای میرزۆراب خان گەورەبوون.

ڕۆژێکیان سەرنجیان دایە، دیتیان ئەوانیش بەشای میرزۆراب خان دەڵێن بابە و دایکیشیان هەر پێی دەڵێ بابە. برایم هەر لە جێی برایمی ئینسانێکی عاقڵ بوو بەدایکی گوت: دایە بۆچ ئەتۆش بە شای میرۆزراب خان دەڵێی بابە و ئێمەش هەر پێی دەڵێین بابە؟ گوتی ڕۆڵە کوڕی وین. دەڵێ ئاخر ناکرێ، دەبێ حاڵیمان کەی. جا دەڵێ خاتوونێ بەکەزیان نەقڵ و بەسەرهاتی لە ئەوەڵ تا بە ئاخر بۆ گێڕانەوە، کاتێ ئەو بەسەرهاتەی بۆ گێڕانەوە جا دەڵێن چەک و ئەسپابی بابی ئێمە چییە دەبێ بۆمان بێنی.

چەک و ئەسپابی برایمیان دا بە برایمی و چەکی مەحمەڵیان دا بە مەحمەڵی. جا گوتی ڕۆڵە شیری ئەو مەمکە و لێ حەڵاڵ بێ بەڵام کارو بە شای میرزۆراب خان نەبێ چونکە ئەنگۆی بەخێوکرد و ئەنگۆی گەیاندۆتێ. جا گوتی قەرار بێ لەتایفەی وسووی موغانی کەسیان لە شاری چەلیاندا نەمێنێ.

دەڵێن وسووی موغانی ئەگەر کوڕی مابوو، کوڕەکەشی نەوەیەکی هەبوو بەنێوی بابی کردبوو. جا دەڵێ ئەو کوڕە لەوێ هەڵات. ئەوی تایفەی وی بوو لە شاری چەلیاندا نەیانهێشت.

ئەو کوڕەش ئەگەر ڕۆیشت چوو بۆ وڵاتی پشدەرێ، بۆ داودیەی لەکن شێخ فەرخ و خاتوون ئەستێ ماوە. جا مەحمەڵ و برایم وڵاتی چەلیانیان داگیر کرد و، وڵات کەوتە دەست ئەوان. شای میرۆزراب خانیش پیر و ئۆفتادە ببوو مرد.

***

## بەیتی کاکە میر و کاکە شێخ

وێژەر: حەمەدی ئاغای
کانی باغی پیرانشار

کاکە میر و کاکە شێخ جافن، دوو برابوون، دێیەکی چکۆڵەیان هەبوو. ئاودەل گۆرانێکیش لەنێو مەرگەییان لە خزم و ئامۆزا و برازاکانی خۆی زیزبوو، خوشکێکی هەبوو ئەویشی سواری پاشکۆی خۆی کرد و هات بوو بە نۆکەری کاکە میر و کاکە شێخان. ئەوانیش زۆریان قەدر و حورمەت دەگرت. گوتیان ئەوە خانەوادەیە و





پەناهەندەبووە، زۆریان خۆش دەویست ئاودەل گۆرانیش یەکە پیاو بوو.

بەڵێ، جا زستانێک بەسەرداهات. غولام و کارداریان نەبوو، ئەسپی ئاودەل گۆرانیش هەردەگەڵ ئی ئەوان بەخێو دەکرا. ڕۆژێک گوتی با بچم بزانم ئەو ئەسپە چۆن بەخێو دەکرێ، ئەگەر چوو هەر تفاقیان لەبەرکرابوو بەبێ پاککردنەوە، بەرپێیان بڵنید ببوو بۆ بەری بانی. جا هاتەوە بەخوشکەکەی گوت: خوشکێ بۆ مە زۆر بێ نامووسی و بێ شەڕافەتیە، ئێمە بەنان و مەتاحی ئەوانە بەڕێ دەچین با غولام و کارداریشیان نەبێ، ئەمن دەچم بەپێمەڕەی بەرپێی ئەسپەکان هەڵدەقەنمەوە ئەتۆش بچوو فڕێی بدە.

بەڵێ ئاودەل گۆران بەو شکڵەی چوو بەرپێی ئەسپانی هەڵقەندەوە و وەلایەکی خست، خوشکیشی نارد ئەگەر بیرێژێ. ئەو خوشکەی ئاودەل گۆرانێ حەزی لە کابرایەکی دەکرد نێوی بەکرە بوو، بەکرە تووشی بوو گوتی: ئەوە دەچییە کوێ؟ گوتی کاکم تەویلەی ئەسپانی هەڵقەندۆتەوە و بەمنی گوتووە دەبێ بچی فڕێی دەی. بەکرەش هێندەی هەموو دونیایەی پێ ناخۆش بوو ئەو کچە بچێتە وێ چونکە بۆ خۆی حەزی لێ دەکرد. جا گوتی ئەگەر چوویەوە کن ئاودەل گۆرانی کاکت، بەگریان و لەخۆدان بچۆوە و بگری، لێت دەپرسێ بۆ دەگری؟ بلێ ئەتۆ دەبێ بچی تەویلانیان بۆ بڕێژی؟ کاکە میر و کاکە شێخ تێم ڕستوون و نامووسی منیان بردووە، جا ئافرەت ملی لە سیحران نا و بەو شکڵەی ڕووی خۆی بریندار کرد و بەگریان و لەخۆدان هاتەوە کن ئاودەل گۆرانی کاکی، گوتی ئەو گریانەت لە چییە، بۆ دەگری؟ گوتی وەڵڵاهی ئەتۆ تۆبزیم لێ دەکەی دەڵەی دەبێ بچی تەویلانیان بۆ بڕێژی، کاکە میر و کاکە شێخ تێم ڕستوون و نامووسیان بردووم.

جا گوتی هیچ کەس ئەو قسەت لێ نەزانێ، ئەو قسە ئاشکرا بێ زمانت لەپشتە سەرت دەردێنم. بەڵێ ئەو غەرەزە لە دڵی ئاودەل گۆرانێ چەسپ بوو پاش دە دوازدە ڕۆژان هەستا خوشکی سواری پاشکۆی خۆی کرد بەو دەستووری پێی هاتبوو هەر بەو دەستوورەی ڕۆییەوە بۆ نێو مەرگەییان.

کاکە میر و کاکە شێخ بێ نۆکەر مانەوە، کوڕی بێوەژنێکیان کردە نۆکەر. دایکی دیزە و گۆزەی دروست دەکردن بۆیە پێیان دەگوت برایمی مێرە دیزەکەرێ. ئاخر کوڕەکەش نێوی برایم بوو.

ئاودەل گۆران چۆوە نێو مەرگەییان و کەس ئەو قسەیەی نەزانیوە، جارێ فەسڵێکی کاکە میر و کاکە شێخ یادی ئاودەل گۆرانیان دەکرد، گوتیان دەچینە نێو مەرگەییان و لە ماڵێ لێی میوان دەبین، ئەگەر بەماڵی دنیایە دەگەڵمان بێتەوە مڵکەکەی هەموو

دەدەینێ و دەیهێنینەوە (مەرگە لە ولاّتی عێراقییە) ئەگەر نەیەتەوەش دوو شەوانی لە مالّی دەبێ دیدەنی دەکەین چونکە دەنێو خزم و تایفەی خۆیدا بۆ وی سەربلّیندییە. جا بەو شکلّەی کاکە میر و کاکە شێخ دەگەلّ برایمی مێرە دیزەکەرێ چوونە مالّە ئاودەل گۆرانی.

بەلّێ چوون لێی میوان بوون قەدر و حورمەتێکی چاکی گرتن. خزم و تایفەی خۆی وەخرِ کرد، ئەو قسە ئاشکرا نەبوو هەتا ئەو ڕۆژەی، جا لەسەر نان خواردنێ خزم و تایفەی خۆی حالّی کرد، گوتی ئەوانە کارێکی ئاوایان دەگەلّ ئێمە کردووە ناموسی مەیان بردووە. لەسەر نان خواردنێ وەبەر خەنجەرانیان دان بەو جۆرەی بەبوختان و بەبێ گوناح و تاوان ئەو دووانە کوژران.

جا ئەستێ و بەغدان خوشکی کاکە میر و کاکە شێخانن، ئەوانن دێنەوە شینگای برای خۆیان دەکەن. جا ئەو بەیتە لەوەی ڕا دەست پێدەکا.

دەلّێ:

ئەورۆ سەرم دێشێ دلّی منی مالّ وێرانێ دەکاتەوە ژانێ

ئەستێ دەلّێ بە بەغدانێ:

خوشکی قەلەندەرێ سەرشینێ مل بەکوێنی بابان وێرانێ

ئەمن دەچوومەوە دیوانی کاکە میر و کاکە شێخان، ئەوە نە لێی دێ

دەنگە دەنگی میوان و نە تەقەتەقی فینجان لێکدانێ

خوشکێ ئەوە ئەمن دەچوومەوە دیوانێ کاکە میر و کاکە شێخان

ئەوە نەلێی دێ خرمەی دەژێر پیالاّن و، وەی برالە دەگەلّ شەقەی دەفینجانێ

خوشکێ دەبلاّ ئەمە بچینەوە سەر کۆپەلّەی دەرجوان

یەکن لەخمی دەینەوە پەنجە و پانێلان، ئەوی دیکانێ

شێن کەینەوە لکی دەکۆلّوانێ، هاوار بەرین بۆ سولّتانی

ئەستامبولّێ پادشای ٢٤ دەولّەتانە، ئەگەر دادیان پرسێ

چاکە، دەنا یەکن دەکەینەوە دادێ یەکن دەکەینەوە فیغانێ

خۆ داوێنەوە بن ئالاّی ئێرانێ.

ئەی لەو زولّمەی لەمە کراوە، کێ دیویە لە دەورەتی دەزەمانان





جووتە برایانت شەقەبکێشن لەسەر سفرەی، دەنا نێو مەجوعمەی

کاشانێ دەگۆشەی مەیدانێ

ئەی کاکینە ڕۆ، هەی بابینەڕۆ، چۆکی دەرک و دیوانانم، کاکە میر و کاکە شێخ ڕۆ.

ئەستی بانگ دەکا و دەلّێ:

وەرە بەغدانی خوشکێ، خوشکە بەغدانی کارەکەری ڕەنگینە

ئەمن ڕۆژان زەینم دەداوە کاکە میر و کاکە شێخان، ئەگەر

لە یەختەرخانەی خۆیان دەریاندەکێشاوە جووتێک جانوولەی

دە نۆزینە.

بەسەرشانی خۆیان دادەدانەوە کەولّی غەزی و، ئەنگوچک زێڕینە

ئەی ڕۆ خۆلّن وەسەر کەن خۆلی دەبەکۆیە

سەلاّو قەت کەسی بەغدانێ نەما لە بۆ مالّە بابی خۆیە

ئەو جێیەی ئەگەر کاکە میر و کاکە شێخان لێیان دەکردەوە شەقێن و سەترێجێنو، شەڕە گۆیە

نارنجیان لەو سەرەوسەری مەیدانێ دادەنان و هەی برالە، تفەنگ و داویشتنێ لە گرۆ، دەترسم نامەردی دەچەلیان و، گووخۆر بابی دەمەرگەییان، لە بەغدانێ قەلەندەرێ بکەنەوە بەبێستان و هەرامەتی بەپەمۆیە

ئەی کاکینە ڕۆ، هەی بابینە ڕۆ، چۆکی دەرک و دیوانانم کاکە میر و کاکە شێخ ڕۆ.

ئەستی بانگ دێلّێ:

وەرە بەغدانێ، خوشکی قەلەندەرێ، سەرشینێ، مل بەکوێن و بابان وێرانێ

ئەمن سبحەینێ بوو هەلّدەستامەوە مەحەلی دەچێشتانێ

ئەوە کەروێشکێ لەمنی دەگوت بەکەوێ، کەروێشکێ لەمنی دەگوت بەکەوێ، دەبلّێ ئەوە مەخایە و گەرمەلاّنی باوینە دامێنی دەکوێستانان، دانێنەوە گەرمەلان و شیرین خەوێ.

ئەو جووتە سوارەکەی ئەگەر ئەمن و تۆیان لێ دەترساین ئەوڕۆکە دوو ڕۆژە ڕانی ڕکێفی و سمێلّی دەنیوە ڕوویان وەبن بارستی دەگلی دەکەوێ ئەی کاکینەڕۆ، هەی بابینەڕۆ، چۆکی دەرک و دیوانانم کاکە میر و کاکە شێخ ڕۆ.

ئەستی بانگ دێڵێ:

دەڵێ وەی براله چەندم پێ گوتن ئەگەر له مەرگەییا میوان دەبن وەره بەشقێ خودای قەت لامەدەنەوە، ماڵە ئاوەدل گۆرانی. ئەوە بۆ شێوێ و، دەکوژنەوە بەرخۆڵەی دەبەرمۆ، له بۆ نیورۆژانه و شەک بەرانێ

بەڵان فیعلی وان گەلێ خەراترن له فیعلی دەشەیتانێ

هەر تەماعی دەکەنەوە دەسەرێ میوانێ

ده یارەبی مەرگەییان هەروابن و هەروایان بەسەرێ

ڕسقیان بچێتە سەر پشتی کەرێ، وەکو کاکە میر و کاکە شێخیان دەدانەوە بەرمەودای خەنجەرێ

له پاش کاکە میر و کاکە شێخان هەی لەبابی منت کەوێ برایمی مێره دیزەکەرێ

ئەگەر بەردەرکەی لەمەرگەییان دەگرت بەتۆڵەی کاکە میر و کاکە شێخان هەژده ئاغای مەرگەییانی دەدانەوە بەرمەودای خەنجەرێ

وەی نەعلەت لەبابی ئەوان وەستایان وەستاکاران ئەوە چونگو سێ بزماران نادەن له گوێ خەنجەرێ بۆ ڕۆژێ لێ قەومانێ

ئەوە هیمدادی نییه زوو له جەلغەی دێتەوە دەرێ، ئەویشیان وەکو کاکە میر و کاکە شێخان لەدیوانی مەرگەییان بەکەلاکی دێناوە دەرێ

ئەی کاکە میر چەند سوارێکی مەرد و ڕەند و قەلاشی

براله ئەگەر دەت بردینه سەر دووکانی تاجری، ئەمه ڕازی نەدەبووین نه به ئەتڵەسی نه به قوماشی

وەی سەڵاو قەت کەسی بەغدانێ نەما لەپاش کاکە میر و کاکە شێخان هیچ کەس ڕانناگرێ نه بەکڵفەتی نه بەقەرەواشی

هەی کاکینەڕۆ، هەی براینەڕۆ، چۆکی دەرک و دیوانانم کاکەمیر و کاکە شێخ ڕۆ.*

***

* لەشەرەفنامەدا دەڵێ: کاکە میر و کاکە شێخ دەچوونه بەغدایه بۆ لای سولتان سەلیمی، عەسر نوێژیان دەکرد مەرگەیی هاتن دەنوێژیدا کوشتیانن.





## بەیتی خەج و سیامەند

وێژەر: حەمەدی ئاغای
کانێ باغی پیرانشار

بابی خەج و سیامەندێ برابوون، بابی سیامەندی براگەوره بوو هەر ئەو تاقه کوڕەشی هەبوو. بابی خەجیش چوار کوڕ و ئەو تاقه کچەی هەبوو، گوتی کاکم هەر ئەو تاقه کوڕەی هەیه و زۆریشی خۆش دەوێ ئەمنیش ئەوە خەجێم داوه بەسیامەندی. ئەگەر مرد ئی گلێیه و ئەگەریش ژیا ئی سیامەندیه. له هەموو عالەمێ مەنشوور بوو که ئەو خەجێ دراوه به سیامەندی. کەتنی ڕۆژگار وایکرد بابی هەردووک لایان مرد، خەج و سیامەندیش پێکەوه هاواڵ شوان بوون وەک «کاکه مەم» و «خاتوزین» و «لەیلو مەجروومان» یەکتریان خۆش دەویست. براکانی خەجێ له سیامەندی جوێ بوونەوه، هەرچی سیامەند بوو فەقیر و دەست تەنگ وەدەرکەوت هەرچی بەره بابی خەجێش بوو دەوڵەمەند و گومڕاه دەرکەوتن. سەبارەت بەخەجێش گوتیان بابم داویەتی ئێمه نایدەین، سیامەند بۆوەی نابێ ببێتە خزمان. لێی پەشیمان بوونەوه هەتا ئەوەی پێیان گوت پێمان خۆش نییه که دەگەڵمان له ئاوەدانی دابێ. جا خەج و سیامەند یەکتریان زۆر خۆش دەویست، بەهەڵگرتنێ نەبا چارەیان نەدەهات. جا عێلی ئێراقی که دێنه ئەو سپی ڕێزی خەیلانیان، ئەوانەی ئەوەی دەوڵەمەندبوو چادری هەڵدەدا، ئەوەی که فەقیریش با کەپر و مەپری دەکرد. خەجی لەوێڕا هەڵگرت و هێنای بۆ سیپانێ.

جا ئەوەش بەیتەکەیەتی:

ئەوڕۆ بەهاره، بەهاره و له دڵی هەموو کەس شادییه

ئەی خودا هاوار، لەدڵی خەجێ قەلەندەر و بابان وێران نەبێ تەنگانه و ڕۆژڕەش و گرێ گرێیه.

سیامەند دەڵێ:

خەجێ مەجالم ئەوەلێ هاته فەسڵی بەهاران ڕاوم لەکوێ پێ خۆشه له سەری سپی ڕێزێ، لەو بەرەوبەر و له لانزاران

خەجێ دەڵێ:

سیامەنده مەجالت ئەگەر پێ خۆشن دەگەڵ بەهارێ مەسڵەحەت وایه ئەمه دەست بگرین و بچینەوه سیپانێ بەقوڕی گیراوێ، حاشارگەی لێ هەڵگرین و، گەلێک بەمه

دوژمنە، دەبلێ بەسەرمدا شۆڕکاتەوە سێبەری دە ئێوارێ

خەجێ دەڵێ:

ڕۆژم ئەوەڵێ دەهاتەوە مەحەلی دەچێشتەنگاوێ

زەینی خۆم دەدا ڕەفعەسیپانێ بەقوڕێ گیراوێ

ئەوە کەڵی دەکەڵە کێویان، دێنە خوار بەبیانووی سەرئاوێ

سمکۆڵێ دەکەن لە هەردی دەپسێن سەری سوێسنێ هەڵاڵێ، بەیبوون و گیابەند و خاوێ، سیامەند، ئەگەر ئەمن پەنجەم دەکوشی هەڵمدەستاندی لە شیرین خەوێ ڕەبی بێمزەڕەت بی نەمزانی ڕەدڵت دەکەوێ غەرەز دەگەڵ نەکاوێ

چەندم دەگوت ئامۆزا، ڕاوی کێویان پەسەند نییە سیامەند بەشقی خودای ئەمن گۆشت نێچیرم لە تۆ هەرناوێ

تەقە لە  تفەنگێ دەهات و دەیدا لە کەڵێ

لە هەمان زۆردارتریان دەستی دەدا کێردێ، ئەگەر سەری لەقەڵای بەدەنێ بکاتەوە

ئەوە بەڵکو خەجی قەلەندەر و بابان وێران لێ بکاتەوە، خەزا، پیرۆزەی دەڕاوێ.

وەی بەرکەسەر نەبێ سەر هەڵدەوەشێنێ، سیامەندی هەڵدەداشت لە ڕەفعەی سیپانێ، بەسەر پەلی دارە بەنێ، فستقێ، سەرەو ژێر دەبۆوە بەپەلی دەدار بناوێ هەی مەناڵە گۆڕ غەریبە مەناڵە

خێر لە جوانی خۆت نەدیوی سیامەندە مەناڵە ئەو کاری خودایە بە بەندەی نابێ بەتاڵە.

سیامەند دەڵێ:

ئەوە خەجێ ئەتۆ مەگری هەتا ئەمن نەناڵم، چ بکەم هێندەی لەبرینی خۆم دەناڵم خەجێ، ئەمن دوو بەشی لەبەگریانی تۆ هەر بێ حاڵم.

خەجێ دەڵێ:

سەری سیپانێ لە من بەدارە ئامۆزا، هەر بەدار بەلاڵۆکە

تەماشای بەختی منی قەلەندەر و بابان وێران، زێدە لە ڕاوچی دەخەڵکی سیامەندە، دەبووە بەپەلی دەدارێ، خەجێ دەماوە، نۆ بووکە.

سەری سیپانێ لەمن بەدارە ئامۆزا، هەر بەدارە سێوە، تەماشای بەختی منی





قەلەندەر و بابان وێران.

زێدە لە ڕاوچی لە ڕاوچی دەخەڵکی سیامەند دەبۆوە بەپەلی دەدارێ

خەجێ دەماوە بەڕەفیقی جند و دێوان، هەر قوڕپێوە

هەی مەناڵە گۆڕ غەریبە مەناڵە، سیامەند دووری دەستم وێت ڕاناگا ئەوە کاری خودایە بە بەندەی نابێ بەتاڵە.

سیامەند دەڵێ:

خەجێ ئەتۆ مەگری، هەتا ئەمن نەناڵم،

چ بکەم خودا نەیدەدا فرسەتم، پێغەمبەر دەگەڵ یەقباڵم

کەڵی دەکەڵە کێویان، ئەوە لەمن بوون بەحاکم پەلی دەدارێ لەمن بوونەوە بەزاڵم

دەنا دەبوو ئەمن ببم بەسەردار و خەجێ ئەتۆ هەر بەحەلاڵم.

سیامەند دەڵێ:

خەجێ چبکەم سەد خۆزگەم بەنەخۆش و سەر ئێش و، بریندار و دەردەداری دەخەڵکی کا، ئەگەر حەکیمیان بۆ بە کرێ دەگرن چ بەکەمی چ بەزۆری، سەریان لەسەر کۆشی خۆشەویستی خۆیانە، بەزاریانەوە دەکرێ جامۆلکە جامۆلکەی دەئاوێ

زۆر شوکور بەقەزاو قەدەری خودای، ئەمن لە پێشیشم سەر دەبزێون پەلی دەدار بناوێ،

دەباغەڵمدا ڕاوەستاوە گۆمیلکەی دەخوێناوێ

خەجێ تۆ خولا لەتۆ وەسیەت بێ ئەگەر مردم، گۆڕ و گۆڕخانەم باوێ قۆچی قەزەنێ، مۆڵی بەرانان، سپی ڕێزی غەیلانیان دەبی بەبووکی دەولەمەندان، ئەگەر هاتی بۆ شاییە و گەڕی دیلانێ،

وەرە پێلاقێکم بەسەرینی دادە، تۆ خولاکەی چ مردنم لێ نییە

دەبلێ قەبری سیامەندە گۆڕ غەریبەکەی من ئەوەتانێ هەناسەی ماشوقان گەلێ گرانە، چین چین دێتە دەرێ لە قەبری بلێند دەبێ بۆ تەشقی دە ئاسمانێ.

خەجێ دەڵێ:

چۆمەکەی زێیە بادینان دێتو لەمن دەداتەوە گێژە

ئەمە هیچ بێ عەمری خودامان نەکردبوو دەگەڵ سیامەندێ خۆ دەستێ هەر بەدەست

نوێژە

خەجێ ڕووی دەکردەوە قیبلەی و، لە سەرەوەی هەورە و لە بنەوەی سامالێ

داخوا دوعای چ ناموسڵمانێکی بوو لەو جووتە ئاشقانە گیربووە سیامەند بەپەلی دەدارێوە دەنالێ.

سیامەند دەڵێ:

خەجێ مەجالم ئەوە لێهاتە فەسڵێ ئێوارێ

کاکت ئەوە هاتن لەبەریان بیارێوە

بلێ برالە بەشقێ خودای، ئامۆزای خۆتانە، نەبادا شپرزەترم کەن و، بەڵکو بەئەسپاییم بێتە خوارێ.

خەجێ دەڵێ:

هەک کوێنی سیامالانم دەبەر بۆ سیامەند، ئەوە دەغیرەت و جورئەتی مندا نییە، چار و قودرەتم نەماوە، لەجێی تۆڕا خۆم هەڵدەدێرمە خوارێ

سەری سیپیانی لەمن بەدارە ئامۆزا هەر بەتاتە.

خالێ ڕوانیت وەک تاق شایی و پەناباتە

ئامێزت بگرەوە سیامەند، خەجێت بۆ هاتە.

***

## بەیتی سەیدەوان

وێژەر: حەمەدی ئاغای
کانێ باغی پیرانشار

سەیدەوان و مەلکەوان و نێچیرەوان برابوون باوکیان ناوی عەبدولعەزیز بوو، داسنی بوو چاوێکیشی کوێر بوو. هەرچەندە کورد بوو بەڵام کافر و خودانەناس بوو. سێ بووکی خواستبوون لە حێلی بادین ئاغای. پرسی بەموسڵمانان کرد گوتی: کوڕینە دەئایین و مەزهەبی نگۆدا چۆنە؟ ئەمن سبەینێ لە تەواوی داسنیانم گێڕاوەتەوە، سێ لەشکران بەرێ دەکەم، سێ داوەتانیش ساز دەکەم، بەیەک ڕۆژ هەمووی جێبەجێ دەکەم. گوتیان وەڵڵاهی ئەوە غەڕەبیە و گومراهیە، دەئایین و مەزهەبی مەدا، ئەوە پەسەند نییە. گوتی ئەنگۆ بێ ئاقڵن، جا ئەمن چ موحتاجیم بەخودایە، حەتمەن هەر دەیکەم ئەگەر خودا





توانی جڵەوگیری کاری منی کرد دەزانم وایە دەنا خودا چکاری بەخەڵکی داوە. ئاوا غەڕە و گومڕا و خودانەناس بوو. جا بزانین لەسەر ئەو خودانەناسیەی ڕا خودا چۆنی خۆ پێ دەناسێنێ و چی بەسەردێ!.

وەختێکی ئەو لەشکرانەی بەرێ کرد بۆ سێ بووکان و ئەو داوەتانەی سازکرد، لەبەر مەغرووری خۆیان هیچیان ئاگایان لەهیچ نەبوو، دوو کوڕی چووبوونەوە ڕاوێ سەیدەوان و مەلکەوان، نێچیرەوانیش لە ماڵێ بوو. بەڵێ، جا تفەنگی هاویشتە پیلی، گوتی هەتا بووک دێ دەچمە شاخی حەیوانێکیش دەکوژم و وەرەزی خۆشم بەسەر دەبەم.

ڕۆیی گەیشتە داوێنی کێوی، بووکی نێچیرەوانی گەیشتە حەسارێ، ئەو کوڕی دڵی تۆقی و مرد. خەبەریان دایە وەرە بگەڕێوە کوڕی نێونجیت پەردوگیر بوو لە باڵ بووکێ نەهاتە دەرێ، گوتی قەیدێ ناکا تۆ خوداکەی خزمینە دەنگێ مەکەن با دەستی داوەتێ بەرنەبێ دڵی کیژ و کوڕانم لێ دەمێنێ. جا چوو لە شاخی لە بازی حەیوانانی دەڕوانی، کوڕەکانی خۆی بوون وەیزانی حەیوانن هەرکی کوشتن. جا بەسەرهاتی تەواوی بەیتی سەیدەوانی، عەبدولعەزیز بۆ خۆی گوتوویەتی.

جا دەڵێ:

ئەوڕۆکە سەرم دێشێ دڵی عەبدولعەزیزە کۆرەی داسنی لەمن دەکا، بێ، نەبێ نێ بەڵام ئەمن دەمگوت مەسڵەحەت وایە ئەگەر باب بە ڕۆژێکی سێ بووکان لە بۆ کوڕانی بێنێ

نەمزانی تەقدیری خودای تەگبیری عەبدی بەتاڵ دەکات و هێلانەی لە عەبدولعەزیزی ماڵوێران دەشێوێنێ

تۆ خولاکەی ئەو کەسانەی ئەگەر خوداشوناسن خەونێکم دیوە دەترسم خولاوەندی میری مەزن پاشای کەڕەمێ ئەگەر موسیبەتێکی گەورەم بەسەر بێنێ

لە من وابوو ئاخری بەهارێیە دەگەڕام لە کیلەگی دەکوێستانان قەت وەگریم نەدەکەوت، قولێک گیا بەشی باقەبێنێ

چبکەم کەسی زۆربەن نییە، ئەگەر داخولا مەڕ و ماڵ و مێگەل و چادر و چیغی عەبدولعەزیزە کۆرەی داسنی لە کوێستانان بەبێ ساحەبی دەمێنێ.

ڕۆڵە دەبەر قافڵە و بازرگانت مرم، ئەگەر بەرێت دەکرد بۆ وڵاتی گەرمێنێ

ئەو پارچە و ئەتڵەس و کیمخوای بۆ جلی دەزگیرانی خۆی دێنێ

ئەمن دەگـەیە دامـێنی کـێـوی مـەقلوبی ئەگـەر جـوابیـان بۆ دەهێنام دەیگوت عەبدولعەزیز، ماڵوێران وەرە بگەڕێوە کوڕ نێونجیت پەردوگیر بوو لە باڵ بووکێ نەهاتە دەرێ

دەمگوت توخولاکەی خزمینە، دەنگێ مەکەن با دەستی داوەتێ بەر نەبێت و دڵی کیژ و کوڕانم لێ دەمێنێ

ئەورۆکە بەهارێکم گەیوەتێ، ڕۆڵە چ بەهارە

سەرم دێشێ دڵی عەبدولعەزیز ەکۆڕەی داسنی چەند لە ئێشە چەندی لەژانە چەندی لەغرووره

ئەمن زەینم دەداوە کـیلەگی دەکـویستـانان سـوور دەبوون سـووره گـوڵ و، هەڵاڵە و بەیبوون دەپشکووتن شەش پەڕ و شلێره

ئەگەر دەستم دەداوە تفەنگێ و ڕووم دەکردە چیای مەغلوبێ

داسنیـان زەینێکە خـۆم دەدا بازی دەکـێـویان دەدا کـە، لفکەی سـەیدەوانی لە پلەی بەردی با ڕای دەژێنێ لێم وایە ڕدێنی نێربە بەلە.

وەی چاوی جاسوسێت کوێر بێ و دەستی پەلاپیتکەت شکێ تەقە لە تفەنگێ دەهات

ئەورۆکـە بەهارێکم گـەیوەتێ ڕۆڵـە سـەیدەوان چ بەهارە، سـەرم دێشێ دڵی عەبدولعەزیزە کۆرەی داسنی چەندی لە ئێشـە و چەندی لە ژانە، وەی خودایە چەندی لە من هاڵۆزە

ئەمن زەینم دەداوە کیلەگی دەکوێستانان سوور دەبوو سوورەگوڵ و هەڵاڵە و بەیبوون، دەپشکوتن گوڵە نەورۆزە

ئەگەر دەستم دەداوە تفەنگی و ڕووم دەکردە چیای مەغلووبێ

داسنیـان زەینێکە خـۆم دەدا بازی دەکێویان کاکۆڵی مەلکەوانێ لە پلەی بەردی با، ڕایدەژێنێ لەمنایە، ڕدێنی نێدبیە بەلەبۆزە

وەی چاوی جاسوسێت کوێربێ دەستی پەلاپیتکەت شکێ تەقە لە تفەنگێ دەهات و کوڕ لەوێ دەخوێنێدا دەگەوزا.

ئەستێرێک هەڵدێ بەری بەیانی،

وەی سەلا لە عەبدولعەزیزە کۆرەکەی بابی سەیدەوانی

ئاوی کوێستانان دێنە خوار، ڕۆڵە بەتوندی، هەر بەتیژی هەڵدەڕێژنە بن سوورە گوڵی





دەسەر بەگژنیژی

توخولاکەی خزمینە وەرن ڕوجمم کەن، کێ دیویە لە دەورەتی دەزەمانان، لەسەر سێ کوڕان ڕا بووک بچنەوە ماڵی دەبابان

بەتارای سوور و هەر بەکیژی

ئەی ڕۆڵە ڕۆ، لەسەر ڕۆیان ئەمن لە دەروونم دێتە دەرێ بڵێسە و بۆسۆیە

نازانم ئەوەندە بەدبەختـی منە سـەیدەوان، نەندامـەتی تۆیە شـەرت بێ لە پاش سەیدەوان و نێچیرەوان و مەلکەوانان لە خۆم حەرام کەمەوە ڕاوێ دەتفەنگێ دەگەڵێ نێریە دەبەلەبۆزە

چیدیکە دەگەڵ قەومی داسنیان دانەنیشم و دەگەڵیان نەکەم جێژنەپیرۆزە.

***

## بەیتی لەشکری

وێژەر: حەمەدی ئاغای

کانێ باغی پیرانشار

سولەیمان خان حاکمی ئازەربایجان بوو لەو «قەڵات ماران»ەی بووە کە دەکەوێتە نێوان قارنێ و نەغەدە و گەڵوانێ. ئەوەی پێی دەڵێن لەشکری، لەشکری نەبووە. ئەوە کابرایەکی قەرەبوو کە ناوی مەحموود بوو، مەحموود هیچی نەبوو خەڵکەکە پەڵە شکارتێکیان بۆ کردبوو، شکارتەکەی درۆوە کە دوو سێ گیشۆکە بوو لەوێی دانا. جا گوتی ئەمن ئەگەر ئەلحان داوای گێرە بکەم کەس گاگێرەم ناداتێ پێی گێرەکەم، وەڵڵاهی وا چاکە برێک وردەواڵەی بکڕم بچمە نێو خێڵی سەران، وردەواڵەکەی بفرۆشم هەتا دێمەوە خەڵک گێرەو مێرەی تەواو دەکەن و ئەوەدەمی دوو سێ ولاغان پەیدا دەکەم بۆ گێرەی (خێڵێ سەران لای سپی ڕێزی خەیلانیانە).

بەڵێ جا ئەو کابرایە کە نێوی مەحمووده خوانچێکی وردەواڵە و شڕەو بڕە کڕی و ڕۆیی بۆ نێـو عـێلی دەئێـراقێ و لەوێ لەمـەدیانێ مـیـوان بوو. مـەدیانیش سـەرۆکی هۆزێک بوو کە هەزار ماڵێک دەبوون، کچێکی هەبوو نێوی مێرێ بوو دەڵێ جوانی وا لە کورەی عەرزێدا نەبووە. لەبەر چارەڕەشیـان مەحموودی بێچارە ئاشقی مێرێ دەبێ. بەڵێ دەردی عیشق زۆر گرانە ئەویش چارەی نەما ڕووی خۆی هەڵاویشتوو داوای مێرێ دەکا.

مەدیان پیاوێکی بەڕوحم و زانا بووە، وەسەرخۆی نەهێناوە و تووڕە نەبووە. لەدڵی خۆیدا گوتی: غەریبە با دڵی نەیەشێ، پەڵپێکی وای پێ دەگرم پێی جێبەجێ نەبێ و وازی لێ بێنێ.

جا گوتی کاکە گیان ئێستا ئەوە وەختی نوخشانە ئەگەر ئەتۆ دە باری ئێسترانم گەنم بۆ بێنی بەئێستر و جەواڵ و گوریس و هەموو شتێکەوە تەسلیمم کەی منیش مێرێت دەدەمێ. بەڵام مەحموود کە زۆر هەژار و نەداربوو دڵی پڕ بوو لە خەم و کەسەر، وردەواڵەی پێ نەفرۆشرا و بەنائومێدی گەڕایەوە بۆ ئاواییەکەی خۆی. دوو گیشۆلکە گەنمەکەی لەسەر چیمەنێکی بڵاوکردەوە. پیرە دایکێکی بوو ئەویشی دەگەڵ چوار بزنان دەگێرەی کرد، لە حاڵێکا کە دایکی کردبووەبنە و هەڵی دەسووڕاندن بەین بەین قامی دەگوتن و بەین بەینیش وا دەگریا کافری پێ موسوڵمان دەبوو. سولەیمان خانیش لەو دەمەیدا پازدە بیست سواری ساز کردبوون بچنە ڕاوێ، جا بۆ خۆشی لەسەر ڕاوێ بوو گوتی کوڕینە ڕاوێ دامەزرێنن، دەعبا ئەگەر هات بۆ من دێ.

نۆکەران ئەگەر چاویان بەگێرەی مەحموودی کەوت قەتیان شتی وا نەدیبوو، دەستیان هەڵتەکاند سولەیمان خان وەیزانی ئەوە تەماڵی کەروێشکیان دیوەتەوە. هات گوتی چییە؟ گوتیان ئاغا ڕاوی چی، ئەوەتا ڕاو، کەس ڕاوی وای نەدیوە. کە سولەیمان خان لێی ڕووانی شتی وای قەت نەدیبوو، زۆری پێ سەیر بوو. چوو بۆ لای و لێی پرسی: کوڕە ئەو پیرێژنە چتە؟ گوتی وەڵڵا دایکمە. گوتی ئەدی ئەو بزنانەت بۆ دەگێرەی کردووە کێ گێرەی بەبزنێ دەکا، ئەو قامە خۆش خۆشانە بۆچ دەڵێی و بەین بەینیش لەگەڵی دەگری؟

گوتی سولەیمان خان، ڕاستی ڕزگاری لەدوایە، ئەمن لە مەدیانی میوان بووم کچێکی هەیە جوانی وا لە کورەی عەرزیدا نییە، قەولی پێداوم بەئەجەلی شەش ڕۆژی دیکە ئەگەر باری دە ئێسترانی گەنم بۆ بەرم و مێرێم داتێ. ئێستاش ئەگەر ئەو قامە خۆشانە دەڵێم لەخۆشی مێرێیە، ئەگەر دەشگریم لەبەر ئەوەیە کە هەرگیز باری دوو ئێسترانم نابێ وڵاغێکیشم نییە ئەگەر لێی نێم، فەقیر و دەست تەنگم.

سولەیمان خان زۆری بەزەیی پێداهات، گێرەکەی پێ بەرەڵڵا کرد هاتەوە لە عەمباری خۆی دە باری ئێسترانی گەنم بۆ داگرت و پیاوی ڕەگەڵ خستن. گوتی بچن ئەو بارانە تەسلیمی مەدیانی بکەن بێ گومان گاڵتەی بەو کابرایەی کردووە، ئەو کوڕەش چونکە ئی ئەو وڵاتەیە و لەژێر حوکمی من دایە مەدیان وەک گاڵتەی بەمن کردبێ وایە، جا ئەگەر مێرێی دابنێ ئەوە چاکە، ئەگەریش نەیدانێ ئەوەی پێتانە بەجێی بێڵن و





بگەڕێنەوە جا من بۆ خۆم دەزانم دەگەڵ مەدیانێ چ دەکەم.

بەڵێ کاتێ پیاوەکانی سولەیمان خانی چوونە لای مەدیانێ و ئەو بارانەیان تەسلیم بەمەدیانێ کرد و داخوازی مێرێیان بۆ مەحموودی کرد، مەدیان گوتی بابە ئەمن گاڵتێکم کردووە بۆیەشم وا پێ گوتووە دەمزانی لەتوانایدا نییە و پێم وابوو بەمجۆرە وازی لێ دێنێ، گوتم غەریبە و میوانە با دڵی نەیێشێ. ئێستاش کچەکەی بانگ کەن ئەگەر مێردی پێکرد ئەوا دەگەڵ خۆتانی بەرن.

کاتێ کچەکەیان بانگ کرد و پێیان گوت، قوڕی دونیایەی وەسەری خۆی دەکرد و دەیگوت مێردی پێ ناکەم. پیاوەکانیش بەپێی فەرمانی سولەیمان خانی هەر چی پێیان بوو لەوێ بەجێیان هێشت و نەیان هێناوە، چوونەوە حاڵ و مەسەلەیان بۆ سولەیمان خانی گێڕاوە.

ئینجا سولەیمان خان لەشکری بۆسەر مەدیانێ دەنگ دا و دەگەڵی بەشەڕهات، مەدیانی لەو شەڕەیدا تێ شکاند و عێلی مەدیانی لەوێ ڕادا بۆ دەشتێ و مێرێی لێ ئەستاندن و هێنای تا لە مەحموودی مارە بکا.

قازی و ئومەنای وەکۆ کردن، گوتی حاڵێکی وایە هەر چۆنێکی مارەی دێ لێی مارەکەن، کچەش قوڕی دونیایەی وەسەری خۆی دەکرد و ڕووی خۆی دەڕنی و مێردی پێ نەدەکرد. گوتیان ئاغا ئەوە بەمە مارە ناکرێ، شەریعەتی ئیسلامێ ئەوە قەبووڵ ناکا، ژن ڕازی نەبێ مارەیی نایە. سولەیمان خان گوتی: کوڕم مەحموود ئەوە حاڵە کەوایە، ئێستاش ئەمن ئەو کچەم ئەستاندووە و هێناومە مادام کە ئامادە نییە مێرد بە تو بکا ئەمن ژنێکی دیکە بۆ تۆ دێنم، سەروەت و ماڵێکی زۆریشت دەدەمێ و دەتکەم بەسەرلەشکری خۆشم. ئەویش قەبووڵی دەکات و لەقەبی دەبێتە لەشکری و ژنێکی دیکەی بۆ دێنێ سەروەت و ماڵێکی زۆریشی دەداتێ و مێرێی مەدیانیش لە خۆی مارە دەکات.

ڕۆمیان واتە تورکانی عوسمانی، سولەیمان خانیان زۆر خۆش دەویست حەفتەی چەلێک دوو چەلی لە دوو دەهاتن و داوەتیان دەکرد.

سەفەرێکی کاغەزیان لێ نووسی و پیاوێکیان بەشوێندا نارد بەڵام سولەیمان خان زۆر نەخۆش بوو نەیتوانی ئەگەر بچێ، کاغەزێکی نووسی و گوتی لەشکری (مەحموود) ئەتۆ ئەو کاغەزەی بەرە بیدە بەتورکان (ڕۆمیان) ئەمن نەخۆشم و ئەوان عوزرم لێ قەبووڵ دەکەن. غایەتی ئەگەر چاک بمەوە بەبێ لەدووناردن دەچم. لەشکری ئەو

کاغەزەی برد و دای بەتورکان، ئەوانیش کاغەزەکەیان خوێندەوە و عوزریان لێ قەبووڵ کرد. زۆریان سولەیمان خان خۆش دەویست و زۆریان پرسیار لە حاڵی کرد، لەشکریش لاقی لەسەر لاق دانا و گوتی ئاغایان نازانم بۆچ هێندەو مولاقات دەگەڵ سولەیمان خانیە؟ گوتیان پیاوی مەیدانێیە و شتێکی گوتی لەسەری سوورە و دەیکا. چەند ساڵە کە حاکمی ئەو ئازەربایجانەیە ئیختیلاف نە دەنێو ئەو دیوەیدا و نە دەو دیویدا پەیدا نەبووە، جا پیاوی وامان خۆش دەوێت چونکە وەعدە بەوەفای خۆی دەکا. لەشکری ئەستۆی بەلاوە نا، چی نەگوت بەڵام پرسیارەکانی هەستی دوو دڵی تورکەکانی بزواندبوو. گوتیان بۆ ئەستۆت بەلاوە دەنییێ؟ گوتی وەڵڵاهی ئەنگۆ وای لێ حاڵێن و ئەمنیش ئەگەر دەیڵێم زمانم دەسووتێ و، ئەگەر نایڵێم دەروونم دەسووتێ، دەنا سولەیمان خان دەگەڵ ئێوە غەیانە دەرفەتی وەگیرکەوێ بۆ کوشتنێ دەسەرتانەوە ناچێ.

گوتیان ئەوە درۆیە، ئەمە هیچ خەراپەمان دەگەڵ نەکردووە و ئەویش هەرگیز خەراپەی بۆ مە نەبووە. مەحموود وەڵامی دانەوە گوتی: ئەمن شتێکو پێ دەڵێم ئەگەر قسەکەی من ڕاست بوو ئەوە چاکە، ئەگەریش ڕاست نەبوو ئەوا پیلی من نەزری ئێوە بێ و لە سێدارەم دەن. گوتیان بیلێ بزانین چییە. گوتی دیارە هەر سەفەرێکی هاتۆتە نێوتان چەند سواری دەگەڵ بووە و هەموو جارێ بە چەک و ئەسلەحەوە هاتووە، ئەو چەلە کە بە چەک و ئەسلەحەوە نایە. بەڵکو خەنجەر و دەمانچەان لە بنەوە لە خۆی دەبەستێ بۆ دەرفەتی خۆی و مەبەستی خۆی و قەولیشی داوە بێت، ئێوە تەفتیشی بکەن ئەگەر بەو شکڵەی بوو ئەوە دیارە ئەمن ڕاست دەکەم، ئەگەر واش نەبوو ئەوە ئاشکرایە کە من درۆم دەگەڵ کردوون و لە سێدارەم بدەن.

بەو چەشنە لەشکری واتە مەحموود تۆوی شک و دوودڵی لە دڵی ئەواندا بڵاوکردەوە گەڕایەوە لای سولەیمان خانی. ماوەیەکی پێ چوو هەتا سولەیمان خان لە نەخۆشیەکەی چاک بۆوە و بەپێی بەڵێنێکی کە دابووی ویستی بڕوا بۆ لای تورکان. جا دەستووری بەلەشکری دا و گوتی وڵاغان خاوێن کەوە ئەمە دەبێ بچینەوە نێو تورکان. لەشکری گوتی ئاغا مەچۆ، پیاوی چا بە. گوتی ئاخر ئەمن بەڵێنم پێداون و بەوەعدەی خۆم دەبێ وەفا بکەم، دەبێ بچم. مەحموود گوتی: ئاغا مەچۆ، ئەمن دەگەڵت نایەم بەزات و سیفەتی خودای ئەتۆ لەو سەفەرەی ناگەڕێیەوە.

گوتی بۆچ؟ گوتی تورکان دەگەڵ تۆ غەیانن، دەتکوژن. سولەیمان خان گوتی: نەخێر ئەوە درۆیە، ئەمن وەک ئاوی ڕەوان عەمەلی خۆم لەبەرچاوە، چلۆن ڕۆمیان ئەمن دەکوژن؟! قەتم خەراپە دەگەڵ وان نەکردووە، ئەوانیش خەراپەی دەگەڵ من ناکەن، نا





ئەوە درۆیە. جا گوتی ئاغا ئەمن دەگەڵت نایەم بەزاتی خولای ئەتۆ لەو سەفەرەی نایەوە. غایەتی ئەمن نەسیحەتێکت دەکەم، ئەگەر قازانجی لێ نەکەی زەرەدی لێ ناکەی. گوتی چییە؟ گوتی خەنجەر و دەمانچەی لەبنەوە لە خۆت ببەستە ئەگەر دەستدرێژیان بۆ کردی ئەوە هەر نەبێ دوو نەفەران وەپێشە خۆت دەخەی و بێ نام و نەنگ نامێنێوە، ئەگەر دەستدرێژیان بۆ کردی خەنجەرێک یان دەمانچێک لەبنەوە لە خۆت ببەستە چ زەردێکی دەکەی؟ کوڕە وەڵڵاهی ئەتۆ لەو سەفەرەی نایەوە دەتکوژن. بەمجۆرە ئەو شکەشی لە دڵی ویدا قایم کرد، جا کاتێ سولەیمان خان چوو بۆ نێو تورکەکان، زۆر بەگەرمی پێشوازیان لێکرد و زۆریان پێشوازی کرد، زۆریان پێ خۆش بوو و بەخێرهاتنیان کرد. سەرسەرەکی و بەڕواڵەت دەگەڵیان گوزەراند بەڵام ئەوان پێشەکی بەپێی قسەکانی مەحموودی لێی بەشک بوون، کە تەفتیشیان کرد دیتیان خەنجەر و دەمانچەی لەبنەوە لە خۆی بەستووە. گوتیان سولەیمان خان، کاتێ کە هاتی پێمان وابوو کە چەک و سیلاحت پێ نییە، ئەوە دروست نییە چونکو پیاو ئەو ڕێگا دوور و درێژە بپێوێ چلۆن دەبێ سیلاحی پێ نەبێ؟ نەیانوێرا توندوتیژی دەگەڵ بکەن، بەڵکو بەخۆشی و زمان لووسانە لەگەڵیا دوان بەڵام دەسەری وەنەچوون و دوای دوو ڕۆژان لەکاتی قاوە خواردنەوەدا زەهریان بۆ دەقاوەی کرد و سولەیمان خان شەهید کرا.

لەشکری بێ شەرەفیش هاتەوە، جا سولەیمان خان کە خێزانی نێوی مێرێ بوو خوشکیشی هەر نێوی مێرێ بوو، کاتێ هاتەوە مێرێی کچی مەدیانی کە خێزانی سولەیمان خانی بوو، ڕووی تێکرد و گوتی: مەحموود ئەدی ئەوە سولەیمان خان بۆچ نەهاتەوە؟ گوتی: ئەو لەوێ بەجێماوە ئەمنی لە دووی تۆو لە دووی خوشکی ناردۆتەوە هەتا بتانبەم، لەوێ قەسری مەلیکیان داوەتێ هەتا ئەوەندەی کە لە ئێرانێدا ح،کمی کردووە ئەوەندەش لە وڵاتی تورکاندا حوکماتێ بکات. بە وەزن سووک و بە قیمەت گران هەرچی پێمان چوو دەگەڵ خۆمانی دەبەین، ئەوەی دیکەش تەسلیم بە هەمەکارانی دەکەین و دوایە دێینەوە بۆیان.

جا مێرێ دەمەدیانی لێی زەنین دەبێ و دەیخافڵێنێ، شڕە و بڕەی تێک دەنا لەناکاو گوتی لەشکری پێم وابێ سولەیمان خان نەماوە، ئەگەر نەماوە کوڕە بێتو ئێمە بەریە نێو ڕۆمان و تورکان ئەوا داگیرمان دەکەن لە قیس ئێرانیش دەچین و لە قیس تۆش دەچین، ئەگەریش ماوە ئەوە قەیدێ ناکا، خۆ بەوەی نییە ئەو دەمی قوڕم وەسەر خۆم دەکرد و دەمگوت مێردی پێ ناکەم ئەگەر دەزانی نەماوە ئەوە ئەمنیش مارەکە و خوشکەکەشی مارەکە و لەجێی سولەیمان خانی دانیشە و حوکماتی خۆت بکە.

بەو فێڵە دڵیان لێ ئەستاند، گوتی وەڵا ئەگەر سوێندم بۆ بخۆن خۆتانم لێ مارە دەکەن پێو دەڵێم. جا سوێندیان خوارد و گوتیان بەو قورعانەی کە کەلامی خودایە ئەگەر ئەتۆ ڕاستێ بڵێیی ئەمە خۆت لێ مارە دەکەین.

گوتی: وەڵا سولەیمان خان نەماوە و تورکان کوشتیان. جا پاش چوار مانگ و دە شەوان حەدیەی هەڵاتو خۆیان لێ مارەکرد. هەر کە مەلا وەدەرکەوتن ژنەکان بەنۆکەرانیان گوت لەشکری بگرن، گرتیان ڕووتیان کردەوە و قۆڵبەستیان کرد و کەلەمچەیان لە دەستی کرد.

هەریەکەی دەستیان لێ دا گازێک و، وەگیانی کەوتن ڕووتیان کردەوە، (جا لەشکری شاعیریش بوو) گوتیان ئەتۆ دەبێ بە سولەیمان خانی هەڵبلێیی، جا هەتا بەندێکی تەواو دەکرد بەگازی یەک لەولایە، یەک لەولایە پڕی ئەو گازەی گۆشتیان لە بەدەنی دەکردەوە، بەسێ بەندان لە گوتن کەوت. بەوجۆرە کوشتیان و لەشکری هەر ئەو سێ بەندەی پێ گوتراوە، کە دەڵێ:

ئەوڕۆ سەرم دێشێ و دڵی لەشکری ماڵ وێرانم چەندی لە ئێشە و چەندی لە دەردە و چەندی لە ژانە

وەی خودا هاوار چ بکەم هیچ کەس نییە و ئەگەر قەڵاتێکی بڕووخێنێ لە دڵی لەشکری دەماڵ وێرانە

ئەمن ئەوە لەسەرم سووربووە دەڵێن لەشکری پیاوێکی حەرامزادەیە و غەیانە

ئەوڕۆ ئەمن بۆت هەڵدەڵێمەوە بەیەختەرخانەی خان سولەیمان خانی کە خانی شای قوڵی بەگیانە

ئەگەر لێی دەبەسترانەوە پێنسەد بۆر و، بدەو و، حدود و، حەدال و کەحێلانە

بەڵام زەینی خۆم دەداوە بازخانەی خان سولەیمان خانی شای قوڵی بەگیان ئەوە لێی دەخوێنن پێنسەد باز و شمقارِ و هەڵەتانجو، شارولو تەرلانە بەڵام ئەمن زەینێکە خۆم دەداوە دیوانی خان سولەیمان خانی شای قوڵی بەگیان ئەوەلێی هەڵاوەسراون، تۆیز و، قەدارە و مەتاڵ و کلاوزریە و حەیزەرانە و هەردەم دێت.

بەمیرات بەجێ مابوون ئەسپاباتی دەپیاوانە و

بەڵام حەیف بوو، بۆ خانێکی وەک سولەیمان خانی شای قوڵی بەگیان ئەگەر لە دیوانی بڵحە ڕۆمیان بەپیاڵێک قاوە لەوێ دەزەهری ماری دەیانکردەوە شەڵاڵ و بێ گیانە





ئەوڕۆ سەرم دێشێ دڵی لەشکری ماڵ وێران چەندی لە ئێشە و چەندی لە ژانە، چەندی لە دەرد و دەردە

بەڵام ئەمن بۆت هەڵدەڵێمەوە بەتیپە سوارەکەی سولەیمان خانی ئەگەر سەر ڕاو و بەر ڕاویان دادەمەزراند و بەدەستووری پادشایان لە زەوێ چل پشکی، بەکوچک و کەڵەک و داشوپەروە و هەڵیان دەستاندەی و شینکەی مەلول و مەلول ماڵ وێران، پەل کورت و پاشوو درێژ و گوێ مەقەست، بەچاوکە، لەرزاوە جووتێکیان تاجیلەی قەڵا دەزێڕێ تێ بەردەداوە هێندێکیان دەیانگوت ڕۆیی و نەجاتی بوو، هەندێکیان دەیانگوت خانە خەراپ بەخودای ئەوە دەگەردالی تۆزیان وەرداوە

ئاغام سووچی ڕکێفێی بەولاغی نیشان دەدا و لەسەری دادەبەزی سەری شینکێی دەبڕی بەکێردی قەر خوڕاسانێ دەسک پوولەکە زەردە جووت پاشووی مامزی کون دەکردن و وەبن سامۆریتێ هەڵدا و

بەڵام حەیف بوو بۆ خانێکی وەک خان سولەیمان خانی شای قوڵی بەگیان ئەگەر لە دیوانی بڵحە ڕۆمیان بەپیاڵێک قاوە لەوێ دەژەهرەماری دەستی لە دونیایە بەرداوە،

ئەوڕۆکە سەرم دێشێ دڵی لەشکری ماڵ وێرانم چەندی لە ئێشە و چەندی لە ژانە،

چەندی لە دەردە، دەردە و لە هەڵاوالە

ئاغام سەفی سوارانی تێک نەدەدان ڕاوی دادەمەزراند و دەگەڕاوە هەر بەرەو ماڵە

سەرلەنوێ هەڵیاندەستاندەوە شینەکەی مەلول و مەلول ماڵ وێران و پەل کورت و پاشوو درێژ و گوێ مەقەست بەچاو، کە لە زراوە جووتێکیان تاجیلەی قەڵا دەزێڕ و کەلە زەرد تێ بەردا و لەبەر هەڵات هەڵاتی دەسواران، خرمەی دە ڕەخت داران، تەقەی دە ئاوزەنگیان ناسکەی دە تولە و تاجیان، ئەوە گوێ کەڕ دەبوو، زمان دەبۆوە لاڵە غەمزە ڕێی دەنیشت چار و قودرەتی نەدەمان خۆی داویشتەوە فیستی شێخ مەحموودی لە سەرەوە ئاڵە. بەڵان حەیف بۆ خانێکی وەک سولەیمان خانی شای قوڵی بەگیان ئەگەر لە دیوانی بڵحە ڕۆمیان بەپیاڵێک قاوە، لەوی دەژەهرماری دەیانکردەوە شەکەت و شەڵاڵە.

جا پاش ئەوەی کە مێرێی مەدیانی و مێرێی خوشکی سولەیمان خانی ئەو سێ بەندەیان بەو چەشنەوە بەزۆری گازی بەلەشکری گوت بردیان لە داریان بەست و حوکمیان لە خەڵکی ئاوەدانی کرد (لەسەر کانیاوێیان لە دارێ بەست) ئەگەر ژنان چوون بۆ کانی دەبێ دەرزیەک یان شووژنێکی لە بەدەنی لەشکری ڕاکەن و دەری

نەهێننەوە ئەگەریش پیاوان چوون دەبێ خەنجەرێک یان کێردێکی لێدەن و دەری نەهێننەوە. بەمجۆرە لە تۆڵەی سولەیمان خانی لەشکریان کوشت.

***

## بەیتی لاس و خەزاڵ

وێژەر: حوسێن شەشە (کەنیلە)
بۆپانەی سەردەشت

دەڵێن: میر چراغ و میر بداغ و میر سۆفی برابوون، هەرچی میر چراغ و میر براغ بوون لە وەردێ و ناوەندێ بوون، هەرچی میر سۆفیش بوو لە وڵاتی باڵەکان مزڵی مەمی خەلان بووە. میر سۆفی لە زەمانی پاشای بەبان دا بوو کە ئەوەڵی پادشایەتیان بوو لە وڵاتی شارەزوورێ. میر سۆفیان زۆر خۆش دەویست، میر سۆفی لە وڵاتی باڵەکان حوکماتی دەکرد و سەردار عێلێک بوو. دەڵێن پادشای بەبان لێی پرسی: میر سۆفی ئەتو هیچ کوڕت نین؟ گوتی بەڵێ، ئەمن کوڕێکم هەیە منداڵە، نێوی ئەحمەدە و عومری حەوت ساڵانە. پادشا گوتی دەبێ بینێری بۆ شارەزوورێ لەوێ بخوێنێ و فێری تیرئەندازی و شیربازی و تەعلیماتێ بێ. بەو جۆرەی ئەحمەد ئاغایان لە عومری حەوت ساڵیدا نارد بۆ شارەزوورێ هەتا عومری بە هەژدە ساڵی گەیشت، یازدە ساڵان لە وڵاتی شارەزوورێ بوو لە تیرئەندازی، شیربازی و سوارچاکی و.........دا یەکەم بوو. وەختێکی ئارەزووی وڵاتی خۆی کرد، بەپادشای بەبانی گوت دەبێ ڕێم بکەیەوە بچمەوە وڵاتی خۆم. بەڵێ ئەحمەد ئاغا لە وڵاتی شارەزوورێ ڕا هاتەوە وڵاتی باڵەکان (باڵەکان کەوتۆتە وڵاتی عێراقێ ئەگەر لە زینوێ شێخی ئاوا دەبی دەگەیە ئەوێ.) کاتێ ئەحمەد ئاغا هاتەوە هیچ کەس پێی نەدەگوت ئەحمەد ئاغای میر سۆفی، بەڵکو هەر پێیان دەگوت ئەحمەد ئاغای شارەزووری. کە هاتەوە مامەکانی پێیەوە چوون، یەکیان ماینێکی زۆر چاکی هەبوو پێشکەشی کرد، ئەوی دیکەیان کچێکی زۆر جوانی هەبوو ئەوی پێشکەشی کرد و گوتیان دەبێ ئەحمەد ئاغا بۆ خۆی بێتە وێ، بەینێکی لەوێ بێ تا ماینی بدەینێ و کچیشی بۆ باوێینە پاشکۆیە و بێتەوە. ئەحمەد ئاغاش بەفەرمانی مامان چۆ ئەوێ و لەوێ یەکیان ماینی بۆ لغاو کرد و یەکیشیان کچی بۆ هاوێشتە پاشکۆیە و بەتاقە سوارە گەڕاوە. دە ڕێیەدا شێخی عارەبان بەخۆی و، دەستە سوارێکەوە تووشی بوون، ماندوو نەبوونی لێکرد. شێخی عارەبان ئەسپێکی زۆر چاکی پێ بوو، ئەسپی شێخی عارەبان بەنێوبانگ بوو. ئەحمەد ئاغا پێی گوت: یاشێخ بۆچی





دەستێکم ئەو ئەسپە بۆ ناوێیە ئەو ماینەی؟ شێخیش دەڵێ: با ئەوەی لە پاشکۆت سوار بووە ماچێکم داتێ هەتا بۆت باوێمێ، ئەحمەد ئاغا قەڵس بوو، کچەکە پێی گوت: خۆ ن ەئێمە ئەوی دەناسین، نە ئەویش ئێمە دەناسێ ئەگەر دەزانی ماینەکەت لەو ئەسپەی دەگرێ ماچێکی دەدەمێ قەیدی چ دەکا (هەڵبەت نەک لەبەرئەوەی کە پێی خۆش بێ بەڵکە مەبەستی ئەوەبوو ئەو ماینە ڕەسەنە لەو ئەسپە چاکە، چاک کرێ) جا دەستێک ئەسپەکەیان هاوێشتە ماینەکە پاش تەواوبوون ئەحمەد ئاغا سواری ماینەکەی بوو ئامۆزاکەشی لە پاشکۆی خۆی سوار کرد، ڕووی دەولای کرد تا شێخ کچەکە ماچ بکا و بڕۆن. شێخی عارەبان هات ماچیکا بەڵام کە نیزیک بۆوە ڕۆهاتە پیلی کچەکەی و، لێی ڕفاند ڕکێفی لە ئەسپیدا و هەڵات، ئەویش ڕکێفی لە ماینێ دا و کەوتە سەری بەڵام نەیگەیشتێ.

شێخی عارەبان بانگی کرد و گوتی: براله بازی ئەسپی من مەپێوە و بڕۆوە ماڵە خۆت تازە نامگەیەی، ئەگەر بەو جانووەی کە لەو ئەسپەی دەبێ تۆڵەی خۆت پێکراوە ئەوە تۆڵەی خۆت بکەوە دەنا بڕۆ لە ماڵێ دانیشە و دەنگێ مەکە.

جا دەڵێن ئەحمەد ئاغا هاتەوە ماڵێ و حەوت ساڵان بۆی دانیشت و، لەو بارەوە باسی هیچی نەکرد و کەس لێی نەزانی کە ئامۆزایان لێ ڕفاندووە. هەتا جانووەکەی لەو ماینەی بوو، لە شیرخۆرەیەوە هەتا وەکو لێ هاتەوەی گرتو، ساڵێکی پێ چوو بوو بەوڵاغێکی زۆر حیسابی. ڕۆژێکی هێنایە مەیدانێ، بازی لە بازی ئەسپی شێخی عارەبان ڕەد ببوو جا گوتی ئەوجار دەتوانم تۆڵەی خۆم بکەمەوە. ئەحمەد ئاغا هەستا بەتاقە سوارە لە وڵاتی باڵەکان وەدەرکەوت و ڕۆیی بۆ مەملەکەتی شێخی عارەبان ئەگەر دەهاتە تەباری وڵاتی ئێراقێ. زۆر گەڕا، تەماشای کرد لە دەڕەیەکیدا دوو سەد چادرێک هەڵدرابوو، هەموو چادری بەفرفرینگە و دوو مەرتەبەیە، گوتی وەڵڵاهی، لادەدەمە ئەو عێلەی، ئیسراحەتێکی دەکەم و دەشپرسم. کانییەک لەبەر ماڵان بوو دوو ئافرەت لەسەر کانیە بوون، یەکیان شیوی دەکرد و دەستی دەشیوێدا بوو ئەوی تریان سەرپۆشێکی بەسەر خۆیدا دابوو و دانیشتبوو. ئەحمەد ئاغا گەیشتە وێ، ئەگەر تەماشای کرد ئەوی شیوی دەکرد ئامۆزاکەی بوو هەمان کچ کە لێیان ڕفاندبوو سڵاوی کرد و گوتی: ئامۆزا ئەوە ئەتۆی؟ گوتی کوڕە ئەرێ وەڵڵا، گوتی وەرە سواربە، گوتی جا تازە؟ ئەمن مارەکراوی شێخی عارەبانم و دوو کوڕم هەن، ئەوە کچی شێخی عارەبانە ساڵی دوو جاری تاو وەچاوی دەکەوێ، جارێکی لە سەروو بەرەوژێری جارێکیش لە کەمبەرە بۆ ژێری. تەواوی عالەمێی بەئاواتە، ئەوی بەرە لەباتی من. جا گوتی ئەگەر

وایە چۆڕێکم ئاوێ دەیە. ئامۆزاکەشی بە کچی شێخی گوت دەستم دەشیوێ دایە چۆڕێک ئاوێ بدە بەو سوارەی، کچی شێخی جامێکێ ئاڵتونی لە کن بوو جامەکەی دەئاوێ هەڵدا و داییە بەڵام ڕووی تێ نەکرد و نەیهێشت ئەحمەد ئاغا ڕووی ببینێ، بەرەو پشتی وێدا. ئاوەکەی لێ وەرگرت و خواردییەوە، دەدڵی خۆیدا گوتی کچی شێخی، قەرار بێ بترفێنم هەتا بۆ خۆشت دوێخینم نەکەیەوە قەراربێ ئەمنیش خۆت تێنەگەیێنم چونکو نەتهێشت ڕووت ببینم. ڕۆهاتە پیلی و هاویشتیە پاشکۆیە، زیڕە لە کچەی پەیدابوو هەرا و گرمە دەعێلێ کەوت ئەوی کەتە بارگینێکی هەبوو کەوتە سەری، ئەحمەد ئاغا ڕۆیی.

شێخی عارەبان ئەگەر بازی ئەسپی ویی دی گوتی بگەڕێنەوە، کەس نەچێ، ئەوە ئەحمەد ئاغای شارەزووریە و، تۆڵەی خۆی کردەوە. ئەحمەد ئاغا ڕۆیی، چل تەریدە لە بەندەنێکی دانیشتبوون سەرۆکەکەیان گوتی ئەوە چەند ڕۆژە چمان وەگیر نەکەوتووە، ئەوە سوارێک هات ئافرەتێکیشی لە پاشکۆیە سوار بووە بچن ئەو سوارەی بێنن، ئەسپابەکەی ئی خۆتان و ئافرەتەکەش بۆ من. جا پێنج تەریدەی بۆ ناردنە خوارێ، ئەحمەد ئاغا کەوتە سەریان ئەو پێنج تەریدە دەرنەچوون پێنجی دیکە هاتن، بەو قەرارەی چواری دی هاتن. ئەو جار سەرتەریدە ئەوەی دەگەڵی مابوو بەحاڵ دەرچوو. ئەحمەد ئاغا ئەو هەموو شەڕەی کرد و تەریدەکانی پەرش و بڵاوکردنەوە بەڵام بەئافرەتەکەی نەگوت ئەگەر چۆنیان ڕێی پێ گرتین و چۆنم کوشتن یان چەند ئازا بووم، هیچ قسەی دەگەڵ نەکرد لەبزی دە لەبزی نەگەڕا، هاتەوە وڵاتی خۆی و کچەی مارەکرد. شەش مانگان گەردن و نێوقەدیان دەتۆقی زێڕدابوو بەڵام هیچیان لێ بەهیچ نەبوو. کچی شێخی عارەبان لە تاوان وەک بەهێیە زەردبوو، دەیگوت خودایە ئەو پیاوە دەبێ پیاو نەبێ، دەبێ بەبەرخوێنی هێنابم ئەتکێم پێ بکا، دەبێ چ بێ؟ عەجایب بۆچی ئەمن شەو و ڕۆژێ دەگەڵ ئەو کابرایەی گەردن و نێوقەدم دەتۆقێ زێڕ دایە بەڵام چ لەوی ساختە ناکەم و چ لەوی نابینم؟ کاغەزێکی نووسی و بۆ دایکی بەڕێ کرد، کاغەز گەییە دایکی، دایکی کاغەزی خوێندەوە. کچە نوسیبووی لە حاڵی هیلاکی دام ئەگەر نەگەیە سەرم دەمرم.

دایکی کچەی هات، ئەڵبەت ژنی دیکەی شێخی عارەبان بوو نەک ئامۆزای ئەحمەد ئاغای. ئەگەر هات بۆ دیدەنی کچی، تەماشای کرد ئەوە کچ وەک بەهێیە زەرد هەڵگەڕاوە. گوتی ڕۆڵە بۆچی وای؟ گوتی دایە لە هیچ شتێکم کەم نییە، مەردی وەک خۆی نییە، جوان چاک و سەردار عێل، بەهێز و بەدەستەڵات غەیاتی لەو سەعاتێوە





ئەمن هاتووم هەر کچم، ڕاپەڕێکی لێ نابینم و پیاوەتیم لێ نەدیوە. جا گوتی مەگەر پیاوەتی نەبێ دەنا چۆن جوانی وەک تۆ لە پاڵ پیاوی دابێ و هەر کچ بێ، ئەگەر پیاوەتیشی نەبێ ئەوە مارەبیت لەوی نەهاتووە و دەتبەمەوە. بەئەحمەد ئاغای گوت دەبێ کچێم بۆ ئیزن دەی، دەیبەمەوە. گوتی بیبەوە. کە کچ گەیشتەوە ماڵی بابی و شێخ ئەو خەبەرەی زانی، گوتی کابرا پیاو نییە و مارەشت لێی نەهاتووە. برازایەکی خۆی هەبوو گوتی بیهێنن لەوی مارە دەکەم و دەیدەم بەوی. هێنایان بەزۆری زۆرداری کچەیان لەوی مارە کرد و شێخی عارەبان بۆی گوێزتەوە، زاوا چووە کن بووکێ. ئەگەر چوو چەکمەی لە پێ دابوو، چەکمەکانی لەلاق ڕاکێشا و چوو لە کن بووکێ دانیشت. مشکێک لەبن دیواری هاتە دەرێ و بۆ بن دیواری دیکە چوو، زاوا لینگە چەکمێکی لێدا و نەیهێشت بڕوا، کوشتی کلکی گرت و ڕایوەشاند، گوتی ئامۆزا چۆنم کوشت؟

کچە گوتی قوڕم وە سەر سەری دا نەکرا، ئەحمەد ئاغا لە ڕێیە چل تەریدەی خەڵاس کردن ئەمنی لە پاشکۆیە بووم ئەو پرسیارەی لێ نەکردم، لەمنی نەپرسی چۆنم کوشتن یا چۆن بووم؟ ئەوە بۆ مشکێکی وا دەڵێ!، وەڵاهی قەراربێ لە ئەحمەدی شارەزووی بەدەر هیچ کەس دەستی وەداوێنی من نەکەوێ.

جا کچ دەستی دا ئافتاوەی، زاوا گوتی ئەوە چ دەکەی؟ گوتی دەچمە دەرێ و دێمەوە کاتێ چۆ دەرێ ئافتاوەی دانا و، هەڵات ڕۆییەوە بۆ ماڵی بابی. شێخی عارەبان ئەو خەبەرەی زانی و، چوو لێی پرسی ئەتۆ بۆچی هاتوویەوە، چییە، چ باسە؟

گوتی بابە، شێت بووی، عەقڵت نییە! خەرفاوی؟ با ئەمنیش دەنگێ نەکەم ئەتۆ نازانی ئەمن مارەکراوی ئەحمەد ئاغای شارەزووریم، چۆن لە کابرایەکی دیکەم مارە دەکەی؟

شێخی عارەبان مەجلیسی گرت و تەگبیری کرد، گوتی بە چ نەوعێک ئەحمەد ئاغای لەنێو بەرین؟ گوتیان شێرێک لەو وڵاتەی دا حاسێ بووە، شوان و گاوان، جووتێر و ئاودێر کەس ناوێرێ وەدەربکەوێ، بنێرە ئەحمەد ئاغا بێ ئەو زۆر لە خۆی ڕادەبینێ، بەگژ ئەو شێرەی دابکە بێگومان ئەو شێرە دەیشکێنێ، ئەو دەم ئەو ئافرەتە مێرد بەهەر کەس بکا، دەتوانێ.

بەڵێ جا ناردیان و ئەحمەد ئاغا لە وڵاتی باڵەکانڕا هات، گەیشتە وێ و لە مەجلیسێ دانیشت شێخیش ئەو تەکلیفەی لێکرد.

ئەحمەد ئاغا گوتی: بەڵێ بەچاوان.

سبەینێ کە ڕۆژ بۆوە ئەحمەد ئاغا ئەسپی خۆی هێنا دەرێ، شاڵو و ڕنەکی کرد و زۆر بەحیسابی ئەسلەحەی هەڵگرت و سواری ئەسپی خۆی بوو و ڕۆیی بۆ ئەو جەنگەڵ و چووغرەی کە شێرەکەی تێدابوو.

شێر کە هەستی ناڵی وڵاغی کرد لە چووغرێ هاتەدەر، چەپی یا دەستی هەڵێنان و بۆ ئەحمەد ئاغای هاتە سەر پاشوان. ئەحمەد ئاغا خۆی لە وڵاغێڕا فڕێ دا و ڕمبێکی وەهای لە تۆقی سەری دا کە لەبەر گەردەنێی چوار قامک هاتەدەرێ، شێری بادا و خستی. جا دەڵێن مەرد ئەو مەردەیە کە ئەگەر شێری کوشت کەوڵیشی بکا. ئەحمەد ئاغاش سەری شێریی لێ کردەوە و دەستی بەکەوڵ کردنێ کرد.

دارێک هەیە دارەلاسی پێ دەڵێن. سێبەری زۆر جوانە کەوڵەکەی لەوێ ڕاخست، گوتی هەتا دەحەسێمەوە ڕادەکشێم. چونکە زۆر ماندوو ببوو. سەری شێریی دەبن سەری نا و لەسەر کەوڵەکەی درێژ بوو.

کە خەبەریان بەکچی شێخی دا و گوتیان ئەحمەد ئاغا ڕۆێوە تا شێری بکوژێ بەڵام گومانی تێدا نییە کە شێرەکە دەیشکێنێ گوتی وەڵاهی وا چاکە ئەمنیش بڕۆم با سوێندم لێ نەکەوێ با وێڕای ئەحمەد ئاغای شێر تێکم بشکێنێ و، نەیەمەوە. ئەویش بەلایەکیدا خۆی دزیەوە و چوو بۆ لای ئەحمەد ئاغای. کاتێ گەیشتە جێگاکە، کە زەینی دایە ئەحمەد ئاغا گیانی خوێناوییە و شێریشی کەوڵ کردووە. کچە نەیزانی کە ئەحمەد ئاغا هەر ماوە، گوتی لاڵ بم، ئەحمەد ئاغا شێرەکەی کوشتووە و شێریش ئەوی شکاندووە، ئەمما توخودا تازە چوو و ڕابرد با بزانم بەڕاستی ژن بوو یان پیاو بوو، نێرە یان مێیە؟ دەستی بۆ دوێخوونی برد و ترازاندی. ئەحمەد ئاغا توند جومگەی گرت و لە بن دارە لاسی کچی شێخی عارەبانی بەدەست گرت و لاسی وەزگی کەوت. بۆیەش ناویان لێنا لاسەشۆڕ چونکە داری لاس شۆڕابەی دێنە خوارێ. بەڵێ، جا ئەگەر ئەحمەد ئاغا لە بن داری لاسی و لەسەر کەوڵی شێرێ کچەی بەدەستەوەگرت، کچە پێی گوت و لێی پرسی: ئەدی بۆچی لەو دەمیەوە ئەمن لە پاڵ تۆدا بووم ئەتۆ خۆت دەمن نەگەیاند؟ ئەحمەد ئاغا لە وەڵامدا گوتی، لە حەیفی ئەو جارەی ئەگەر ئاوەکەت ئاوا بەرەو پشت وێدام. بەڵێ جا پاشان ئەحمەد ئاغا سواری ئەسپەکەی بوو، کچەی لە پاشکۆی خۆی سوار کرد و کەوڵی شێریشی بەپێشکۆی زینیەوە کرد و سەری شێریش بەڕمبێوە بەرەو عێلی شێخی عارەبان کەوتەڕێ. کە دوور و نزیک وێ بۆوە تەواوی عێلەکەی بەپیریەوە هاتن، چەند ڕۆژان لەوێ ماوە جا پاشان کچەی لەگەڵ خۆی سوار کرد و گەڕانەوە بۆ وڵاتی باڵەکان.





وەختێک ئەو ژنە حامیلە بوو دوای ماوەیەکی خوا منداڵێکی دانێ و ئەحمەد ئاغا بۆ خۆی نێوی لێنا لاسەشۆڕ. ماوەیەکی دایانە دەستی دایانان بەخێویان کرد هەتا عومری گەیشتە حەوت ساڵی و ئەوجار لەبەر خوێندنیان نا. عومری بەدوازدە و سێزدە و چاردە گەیشت ئەحمەد ئاغا کونجی قەناعەتی گرت و لاس بوو بە ئاغا و دەستی بەحوکماتێ کرد. لە وڵاتی باڵەکان هیچ کەس نەیدەتوانی بەبێ ئەمری وی بەو مەملەکەتەیدا ڕابرێ و، کەس دەگەڵ لاسی بەربەرەکانی پێ نەدەکرا.

ڕۆژێکی دەروێشێک لەبەر دەرکێ یاهوویەکی کێشا، لاس ئەوەندی بەدەستیەوە هات وێیدا. دەروێش گوتی: بریا لاس هەر نێو و نێوبانگم بیستبای بەڵام قەت نەمدیبای.
لاس گوتی: بۆچی؟

دەروێش گوتی: وەڵاهی بەخۆت و خزمەتکار و دەستوپێوەندەوە، بەهەمووتان بەتاقە کارەکەرێکی خەزاڵەشۆڕی مەلا نەبی نابن.

لاس گوتی: خەزاڵە شۆڕ کێیە؟ نەیدەزانی خەزاڵە شۆڕ لە چ مەملەکەتێکە و، تازە نێوی لەو دەروێشەوە دەبیست. دەروێش لە کن خەزاڵیش هەر ئاوای تاریفی لاس کردبوو، ئەو قسە لە دڵی هەردووکیاندا مەراق بوو.

هیچیان هیچیان نەدەدیت. دەڵێ ڕۆژێکی لە ڕەوەی لاسی دوو ماین نەهاتنەوە، لاس بەغەزەب داچوو دوو کەسی بەشوێنیاندا نارد. لاس گوتی: کێ بێ بتوانێ بێ لە ڕەوەی من ماینان بەرێ، لەهەر کەسێکی ئاشکرابێ قەراربێ خاکی بەتورەکان بێنم. دەڵێن پیاوێکی پیر و کوڕە جحێڵێک کە پێکەوە ڕەفیق بوون و هەردووکیان پیاوی لاسی بوون. دەستیان بەگەڕانێ کرد. زۆر گەڕان تا بەسەر هۆبە و هەواری خەزاڵێکدا کەوتن، پێیان وابوو مەحشەرە، ئاخر زەمانە. لە کابرایەکیان پرسی: بابە ئەو هۆبە و هەوارە ئی کێیە؟

کابرا گوتی: بۆ مەگەر بابم، خەڵکی سەر عەرزی نین؟ ئەوە هۆبە و هەواری خەزاڵە شۆڕی مەلا نەنیانە. خەزاڵە شۆڕ کچی مەلا نەبییە، مەلا نەبی و مەلا داود بران. سەردار عێلی سورچی و، زرار و، ڕەمک و ڕەبەن و، مام ساولۆ و غەیلانیانن. ئینجا پیاوەکان گوتیان: ئەدی ئەمە میوانی کێ بین؟ کابرا گوتی: بڕۆن میوانی لامێردانی خەزاڵێ بن (لامێردان عیبارەتە لە دیوەخانێ) ئەوانیش چوون میوان بوون، ئەوێ شەوێ چ میوانی دیکەی لێ نەبوو، خەزاڵ لەودیوی ڕا بانگی کرد و گوتی: ئەو میوانانە کێن؟ گوتیان کابرایەکی پیرە و کوڕە جحێڵێکی دەگەڵە.

خەزاڵ گوتی میوان یا دەبێ بزنێ بدا یادە بی شتێکی بڵێ. ئەوانیش گوتیان وەڵا ئەمە نازانین، فەقیرین گەڕاوین و ماندووین، ڕێمان کەوتۆتە ئێرە. ئەویش گوتی قابیل نییە، لە وڵاتی مە ئەوە دەستوورە، هەر میوانێکی بێ دەبێ یان بزنێ بدا یان شتێکی بڵێ. پیرە گوتی: یای خەزاڵ ئەگەر میوان بزنێ بدا، خانە خوێ شەوچەلەی لەسەرە، جا گوتی ئەگەر قامەکەت خۆش بێ شەو چەلەشت دەدەمێ. کابرای پیر دەست پێدەکا و بەتاریفی لاسی دا دەچێ و دەڵێ:

بەڵان کێ بوو لەبەر مامێ ڕدێن سپی، دەڵێ خەزاڵ بەسەری تۆ سەرم لە ئێشە دڵم لە ژانە، قایمەتی لە ژانە، ژانە

وەختایەکی ئەمن وەڕێ دەکەوتم، لە وڵاتی باڵەکانە

چەندم حەول دەدا، دەگەڕام لە دوای مایناتە وەسەر دەکەوتم لە کوێستانی عەزیمەت و گەورە و گرانە

خۆم هەڵدەداشت لەوان نەویانە

ئەمما دەو دەمەی دا بەسەر هۆبە و هەواری تۆدا دەکەوتم

لەمن وایە حەشرە و ئاخر زەمانە

مەنسووری هەرادە و کوی بەپەرێ دەکرانە تەرازوو و میزانە، خێر و شەڕ بەش کرانە

لەو دەمەیدا تووش دەبووم بەپیاوێکی مەزلوومۆکە وەکو خۆم بەستەزمانە پەسەری زمانیم لێ دەپرسی بابە ئەو هۆبە و هەوارە ئی کێیە قەت نەهاتوومەتە ئەو وڵاتانە

دەڵێ بابە نازانی هۆبە و هەواری خەزاڵە شۆڕی مەلا نەبیانە

دەڵێ ئەمن نابەڵەدم لە کوێ ببمەوە میوانە

دەیگوت هەڕۆ لامێردانی خەزاڵی، جێگەی شا و، میر و بەگلەرانە

خەزاڵ بەسەری تۆ تاوڵت ئەتڵەسە لەسەر بیست و چوار چڵانە

ڕستەی تاوڵێت خەیاتی کۆ و حەلەب و میسر و شام و دياربەکر و ئیسفەهانە

لە دیوەخانێت ڕاخراون پێنسەد فەرشی قەرە خوراسانە

داندراون کورسی و سەندەڵی شاماغاجی لەوی پێچک نەردیوانە

ئەمما لەلایەکی کاغەز نووسینە و لەلایەکی مۆر لێدانە

ئەوە لە دەرکی تاوڵێت بەستوونەوە، چەندە ماینی مەحەندەکی یاڵوش بەرەنگاری





کلک لەسەرچوانە

وڵات بەتەم، دەنگوت لەمن وایە دنیا خەرا دەبێ نەمدەزانی ئەوەش تۆزی ڕێگای مەڕ ومێگەلانە

خرمێک لەبنی گوێم پەیدا دەبوو، لەمن وایە قەتاری ئارون و قاڕوونییە بەقاری عەرزیدا دەچێتە خوارێ، نەمدەزانی ئەوەش خرمەی تۆف و تەلەسم و گوارە و کرمەکی دەوان شەنگە بێریانە

خەزاڵ بەسەری تۆ لە دەورەت هەر خیوەتی ئاشقان، میر عەزیز و میر بداغ و ئەحمەد ئاغای سورچی و، مەمەندی فەقێ وەیسی دەگەڵ خیوەتی خێڵە ڕەشیانە

سەد ئەوەندەی دیشت لە دەورەی بێ ئێستاش نابێ بەتاقە سەحاتێکی لاسە شۆڕی باڵەکیانە

بێت و، ببینی حۆل دەبی گێژ دەبی لە مەیدانێ دەوکەوی شەلاڵ و بێ گیانە

ئەگەر مەیلت لەسەر بێ قەرار بێ ئەمن بەوەعدەی پازدە ڕۆژی دیکە بۆت بنێرمەوە ئێرانە.

**

خەزاڵ لەو دیوی ڕا بانگی کرد، گوتی خالە دادەی وەرە ئەو دیوەی، وەڵاهی قامی خۆش دەزانی. بەڵێ لێی پرسی لە چ دەگەڕێی؟ گوتی ئەمن پیاوی لاسیم، پیاوی لاسە شۆڕی باڵەکانم. ماینمان لێ دزراون، لە ڕەوەی ماینان دەگەڕێم. گوتی: ماینەکان پیاوی من هێناویانن، ئەمما فرۆشتوومن (ئەگەرچی درۆشی دەکرد) لە دڵی خۆیدا گوتی ئەگەر وا بڵێم لاس پیاوێکی کەللەییە و وەدوای ماینان دەکەوێ و دێتە ئێرە. جا گوتی لاس، چ لاسێکە؟

گوتی ئەگەر بیبینی هۆشت نامێنێ، دەزانی پیر و ئوفتادەم، ماندوو و فەقیرم دەتوانم لە دە بەشان بەشێکت بۆ باس بکەم.

دە گوتی بڵێ بزانم لاس چ کەسێکە، کابراش دەستی پێکرد و گوتی:

بەڵام کێ بوو لەبەر مامی ڕدێن سپییە،

دەڵێ خەزاڵ بەسەری تو سەرم لە ئێشە دڵم لە گلەییە قایمەتی لە گلی گلەییە

ئەگەر ئەتۆ دەپرسی لاسە شۆڕی باڵەکییە کوڕی ئەحمەد ئاغای شارەزوورییە نەوەی میر سۆفییە